## شەباهەنگی بەفر

بە گیانی ئاونگیت سوێند دەخۆم
ئەی خەنەبەندانی فیردەوسی ڕۆحم
کە تەمەنی کچێنی بارانە نەباریوەکانم
بیر نەچێتەوە...!
بەسەبکی باڵای ڤینۆسیت سوێند دەخۆم
ئەی جاویدانتر لە گزنگی سەحەر
کە شەوی پەردەی پەپوولەو ئەستێرەکانم
بیر نەچێتەوە...!
لە بیرمایە لە یەکەم شەوی تەمەنم دا
مۆمم لەناو لەپی دەستەکانی خۆم داگیرساند
ئەم شەویش بە شەڕابی فرمێسکەکانی ئەم مۆمە
خۆم مەست دەکەم و یەخەی قەدەر دەگرم.



بۆ تەنها ساتێک،
ژاوەژاوی ئەم زەمەنە سەر شێتە جێ دەهێڵم
لێم گەڕێ:
با لە پەنجەرەی چاوەکانت بێمە ژووری
دەمەوێ،
لەگەڵ فرمێسک و هاواری شیعر لە دایک ببم.
دەمەوێ، لەگەڵ ئاخی گوڵە نێرگزییەکانی
سەفەرکردووی بەختت گەورەببم...!
سڵاو ئەی عەشق
سڵاو ئەی جاویدانتر لە فیردەوسی «با»
سڵاو ئەی خەونە زڕاوەکانی ڕۆژگارە،
وەجاغ کوێرەکان...!
ئەمشەو..
سەرقافڵەی تریفەی مانگ دڵی پڕە.
گەڵا دۆزەخییەکانی تارماییە ڕەشەکان
ڕێگاکانی بەهەشتیان داپۆشیوە.

ئەمشەو...
هەردوو مەمکی تەمەنی کچێنی عەشق
بەسەر شانم شۆڕبۆتەوە.
لە قوولایی دڵە خەمناکەکانیان،
تف لە ئاوێزانبوونی هەوری ئافات و
خەونە کابوسییەکانی قەدەر دەکەن.
ئەمشەو..
چیرۆکە پەنهانییەکانی عەشقە ئەبەدییەکان.
بوخچەی گرێدراوی شەهوەتیان دەکەنەوەو
کێڵگەی مێژووە نەفرەتکراوە وشک هەڵاتووەکان
ئاوپژێن دەکەن..
ئەمشەو...
تریفەی مانگ و گوڵبارانی هەورو هەناسەی «با»
بەیەکەوە پیاسەیەک بە شەقامەکانی نامۆییمدا دەکەن
سڵاو ئەی گوڵە بەفرینییەکانی فیردەوسی رۆحم
سڵاو ئەی گۆرانییە بە سۆزەکەی لاشەی برینداری



بەریارانی عەشق...!
سڵاو ئەی شەباهەنگی نێو مەمکۆڵەی بەفر
خۆم دەخزێنمە نێو باوەشی هەڵمی رووبارە شەرمنەکان
لەگەڵ کازیوەی عەشق پێکەوە سەفەر دەکەین
دەمەوێ لە ئاهەنگی لە دایکبوونی خۆر سەما بکەم.
تا لە بەهەشتی خەونە سک پڕەکانی بەهار
دەسکە گوڵێک بۆ تەمەنی کچێنی خۆم و بۆ گەڵا پاییزییەکانی
ئەم دەڤەرە بەدیاری بهێنم..!
ئای کە ئارەزوومە،
شەوێک بە چاوەکانی خۆم ببینم
مردنی وەرزەکانی بەفرو غەریزە سڕبووەکانی درەخت
ئاوێزانی یەکتری بن
ئەوسا پڕ بەدڵم
بۆ شەوە سوورەکانی مەملەکەتی خۆر گۆرانی دەڵێم
لەگەڵ پشکوتنی گەڵا بەهەشتییەکانی عەشق
شیعر دەخوێنمەوەو

لەگەڵ بەستەی شەوبەراتی ئەویندارە فیردەوسییەکانیش
زیکر دەکەم.
سڵاو ئەی شنەبای نێو هەناسەی پەلکەزێڕینەی
ئێوارانی عەشق
سڵاو ئەی فرمێسکە بێ گەردەکەی گۆنا شووشەییەکانی «با»
سڵاو ئەی خۆزگە سنەوبەرییەکانی سەرسینگی پەپوولە،
تازیەدارەکانی بەهەشت...!
ئەمشەو دەڕۆم..
لەگەڵ خەونەکانی گوڵەگەنم سەفەر دەکەم.
تا ناونیشانێک بۆ شیعرە ئەفسووناوییەکانم نەدۆزمەوە
نایێمەوە
ئەمشەو دەڕۆم...
لەگەڵ میزاجی ڕۆحی ئەستێرەی کاروانکوژەو
بریسکەی پرچە بەفرینییەکانی دایکم سەفەر دەکەم
تا لە ئەفراندنی گۆرانییە خۆڵەمێشییەکانی کچێنی لافاو
تێ نەگەم نایێمەوە..!



ئەمشەو دەڕۆم..
دەبمە شۆڕەسواری سەفەر
دەبمە شۆڕەسواری خەونە پەمەییەکانی کچان
دەبمە شۆڕەسواری عەشق
دەبمە شۆڕەسواری شەباهەنگی نێو مەمکی بەفرو
شۆڕەسواری جاویدانی فیردەوسی ڕۆح..!

ئازاری ١٩٩٦

## سەمای لەدایکبوونێکی تر

ئەی ئەوانەی
بۆ ناشتنی بزەی سەحەری خەونەکانم چاوەڕێنە
ئێوە لەنێو دوورگەی قڵێشاوی لەپی دەستم لە دایکبوون
دەزانم،
دڵی هەمبانەی خۆزگەکانتان لێم بەقینە
سیمای دڕندانەی سەرمایەتان گرژو ڕەشە.
دێتە بەر گوێم،
هەموو شەوێ بەچرپەوە باسم دەکەن
بەسەرهاتم بۆ یەکتری دەگێڕنەوە.
دەتانەوێ پەڕەمووچەی باڵەکانی کۆتری هیوام
دەربهێنن.
چیتر شەوان چاو لێک نانێم. نەبادا بێن،
ساڵنامەی مانگەشەوی تەمەنم ئاوەژووکەن.



هەردوو دەست و مەمکی هەورە بەهارییەکانم ببڕنەوە.
من قەتماغەی زامی سەختی دڵی مێژووم.
لەگەڵ یەکەم چرپەی گریان لە دایک بووم.
من ژیلەمۆ و بزەی لێوی وەرزەکانم
تا دێ ڕەنگم گەشتر دەبێ.
تا دێ، لەناو منداڵدانی شەوە تاریکەکان
سۆماو نیگای چاوەکانم تیژتر دەبێ.
من بارانم گۆنای گژوگیا تەڕ دەکەم
تیشکی خۆرم، گڕ لە هەڵمی سەر دەریای ناخم بەردەدەم
من پاڵەوانی ڕۆمانێکی بێ کۆتاییم
هەناسەم خوێنی گەرمی دڵی مۆمیاکراوی چرایەکی
کوژراوە..!
من شەوانان،
گوێ لە ئاوازی لەرینەوەی گەڵا وەریوەکانی ڕۆحم دەگرم.
چیتر شەوان چاو لێک نانێم، نەبادا بێن
دەفتەری یادگارییەکانی تەمەنم بسووتێنن.

ئێستاش، خۆم و بوخچە نەکراوەکەی هیواکانم
خۆم و گۆچانە درێژەکەی دەستم
لەسەر گردی ئەو تابلۆیە ڕەشەم
کە بە دیواری پێشانگاکەی دڵی مێژوو هەڵواسراوە.
من گۆرانییەکی پڕ لە عیشقی مەمکی گوڵم
لەو ڕۆژەوەی خۆم ناسیوە
لەناو ئاوێنەو سەرابی ڕۆحی مندا
سەمای لەدایک بوونێکی نوێ و
مۆسیقایەکی تەڕو خۆرەتاوی دنیایەکی تر دەبینرێ..!

بەفرانباری ١٩٩٤



## بەهەشتی سەراب

ئەستەمە لە بیرکردنی ساتە چاوەڕوان کراوەکانی
فریشتە خەمناکەکان.
لە بیرکردنی شەوانی تەنیایی شەنگەبییەکی ڕۆح سووک
لە بیرکردنی ئەو ساتەی،
دەستم خستە بن سەری هەورو نیگای گەرمی مانگم خوێندەوە
نەمردم، شەوێک لە شەوانی تەمەنم
لە کاروان سەرای غەریبان و بێ داڵدایان
لە شەوە تاریکەکانی مەملەکەتی شەمشەمەکوێرەو غوربەت دا
بە دیار ئاگردانی بزەی ڕۆح سەلەفیەتی مێژووم نووسییەوە
ئەو خەونە شیرینانەی لەم شەوانەدا دەمبینی
هەموو جار، بۆ ئەو ڕووناکییە چوار گۆشەییەی
کە دەمەو ئێواران دەبوو بە میوانی دڵم دەمگێڕایەوە...!
شەوانان ئەو پەڕەسێلکە بێ پەڕو باڵانەم لە باوەش دەگرت

کە لە کەنار دەریای نامۆیی و
لەناوقۆزاخەی تەمتوومانی سەرشێتی دا خۆیان ون کردبوو
ئەو دەمانەی کەڤاڵی هونەرمەندێکی عاشق دەبینن
توورە مەبن.
سواری سەرشەپۆلی رەنگەکانی بن..!
هەموو لقی درەختێک رەهایە کاتێک کڕنووش بۆ ئاو دەبات و
تێنوێتی رەگی شەهوەتیان بە یەکتر تێر دەکەن.
ئەو کوڕە شەرمنانەی شەوانان بێ نوێژ دەبن گوناهن
هەمیشە خەون بەو دەستە نەرمۆکانە دەبینن
کە لێیانەوە فێری عەشق بوون...!
دەخیلتم ئەی عەشق:
دەخیلتم ئەی بەرائەتی پێکەنینە کۆرپەلەییەکانی
نێو منداڵدانی روخسارە نامۆییەکان.
فریام کەوە ئەی عەشق
من بەدوای خەونەکانی «ئاو»دا دەگەڕێم...!
دە فریام کەوە فریا..



با ژوورە تاریک و خامۆشەکان رووناک بکەینەوە، ئەی عەشق...!
دەفتەری بیرەوەری موسافیرەکانی ئەو وێستگەیە
بخوێنینەوە
تا لە بێهودەیی نێو خەڵوەتی دەروێشانەو لە ئەبەدیەتی
توانەوەی روحتان تێ بگەن.
وەی گیان، ئەی پەپوولە رەنگاورەنگەکانی نێو گوڵزاری بەردیدەم.
وەی گیان، ئەی نم نمە بارانی مەمک فەریکەیی.
وەی گیان، ئەی کۆترە سپییەکانی دەمەو نیوەڕۆیان یاریتان
بە ئەلقەی پەنجەم دەکرد
وەی گیان، ئەی منداڵە وێڵەکانی سەرشەقامەکانی گەردەلوول
وەی گیان، ئەی هەناسەی خۆری شەبەقی بەیانی
وەی گیان، ئەی مردووەکانی نێو گۆڕستانی بەهەشتی سەراب، وەی گیان...!

بەفرانباری ١٩٩٦

# کەرنەڤاڵی لە دایک بوون

❖ گوڵ لێرەیە، لێرە سەما بکە ❖
کارل مارکس

سەما بکەن
کەرنەڤاڵی لە دایک بوونمە
گوڵ لێرەیە، هەر لێرەش پشکۆکان دەگەشێنەوە
ئێرە هەوارگەی خەنەبەندانی ئەوینە
دەگوێ راگرن لە گۆرانییەکانی درەخت و لە پێکەنینی شنەی با
دەگوێ راگرن لە سەمفۆنیای ئاونگە سپێدەییەکان و
لە مۆنامۆترین مۆنامۆی خۆشەویستی
کەرنەڤاڵە، کەرنەڤاڵە، کەرنەڤاڵ.
کەرنەڤاڵی لە دایک بوونی خۆرەتاو و ئەستێرەیە
کەرنەڤاڵی لە دایک بوونی شەپۆلەکانی دەریاو



سەمای گوڵە وەنەوشەیە.
کەرنەڤاڵی لە دایک بوونمە،
دە سەما بکەن، دەی دەسەما بکەن، سەما بکەن سەما..!
من هاتووم!
تارماییە لێڵەکانی بەرچاوتان لابەرم
هاتووم، کابوسی نێو خەوی شەوە یەڵداییەکانتان
راوبنێم و شەمشەمەکوێرەکانی تاریکیش سەر ببڕم.
مێژووم شاهیدە مێژوو.
بەبەرچاوی رۆشنەوە هاتووم و بەرەو دنیایەکی باشتر دەڕۆم
تەنیا منم لەوەتەی لە دایک بووم،
پەرچەمی یەکسانی خوازیم دەبریسکێتەوە.
تەنیا منم لەوەتەی هەم لەگەڵ شەوەزەنگ دەجەنگم
خۆرەتاویش لەناو لەپی دەستەکانم گەش را دەگرم.
تەنیا منم بە تەنیا من،
لەوەتەی هەم ئەو شەپۆلەم.
کە گۆرانییەکانی.. دوێنێ و ئەمڕۆ و سبەم.. یەک ئاوازە

سەربەرزانە هەموو ڕۆژێک هەر دەیڵێم و دەیڵێمەوە.
تەنیا منم لەوەتەی هەم پەناگەی ئەویندارانی بێ نەوایانم.
لەبەردەم ڕەشەبای ئافاتە فیرعەونییەکان،
کڕنووش نابەم و دەروازەی جێ ڕاوگەی ئەوینی و
سەمای ڕەهاییە ئەبەدییەکانتان بە ڕوو داناخەم.
تەنیا منم، گرمە گرمی هەورە ڕەشەکان و
برووسکە سەر شێتەکانی ئاسمانی «شەڕ» ڕیسوا دەکەم.
کاتێک کە شەوانان لە نێو ماڵ و حاڵی خۆتان لە خەوی شیرین
ڕاتان دەپەڕێنێ..!
تەنیا منم بە تەنیا من،
لەسەر لێوی خەونەکانی منداڵە بێنازەکان چرۆ دەکەم و لە ئامێزی
خولیا و ئومێدی مرۆڤە ماندووەکانی خێڵی کاریش گەورە دەبم.
گوڵ لێرەیە، دە هەر لێرەش سەما بکەن.
ئاخر کەرنەڤاڵی لە دایک بوونمە.
دەسەما بکەن، دەی دەسەما بکەن، سەما بکەن سەما...!
هۆ ژنانی لووت بڕاو، قژ سووتاوەکانی بێ گوناه



هۆ کچۆڵە عاشقەکانی لێو بەخەم
هۆ منداڵە دەست فرۆشەکانی سەرشۆستەی گەردەلوول.
هۆ پیاوانی سەرگەردان و شێواوەکانی نێو دۆزەخی یەڵدایی.
ئەی ئەوانەی،
تەمەنێکە لەگەڵ سفرەی خالیتان ڕەنگی یەکترتان گرتووە.
ئەی کۆیلەکان،
هەر هەمووتان دەپێم بڵێن...؟
«کێ ڕزگارتان دەکات جگە لەوانەی وەک خۆتانن»*
ئەوەتانێ، ئەوە لەپێی دەستەکانم
بە بناری دەمارەکانی ناخم هەڵگەڕێن.
بەناو خوێنی دەریای عەشقم بتوێنەوە.
با پێکەوە، بەرەو بەهەشتی خۆشەویستی و
بەرەو دنیایەکی باشتر بڕۆین.
دەوەرن لە تەکما ڕێ بکەن
با پێکەوە، پۆڵ پۆڵ گۆرانی بۆ گوڵەگەنم و
بۆ خۆرەتاوی ئەڤین بڵێین.

ئەی کۆیلەکان هەر هەمووتان،
دەوەرن دەی، کەژاوەکەم گەورەتر کەن
گوڵ لێرەیە، هەر لێرەش پشکۆکان دەگەشێنەوە
دەسەما بکەن، ئاخر کەرنەڤالی لەدایک بوونمە
دەسەما بکەن، دەی دەسەما بکەن، سەما بکەن سەما...!

* بەرتۆڵد برێخت

حوزەیرانی ۱۹۹۷



## سەمفۆنیای گوڵ و نان

باڵندەکان، لە ئامێزی مانگ راکشاون.
سەریان لە خەنەی «با» گرتووە
بە دوای پێستی مارمێلکەکان دا دەگەڕێن
پێڵوی چاوی تەرمەکان هەڵدەدەنەوەو
سەمایەکی بێ گۆرانییان لە پێش دەکەن
ئێرە گۆڕەپانی شۆڕەسوارانی غارغارێنە
گەنم لە گۆڕستانی ژێر سینگمان دەنێژرێ
پەلکە زێڕینە،
بە حەیرانی تاڤگەو خۆرەتاو دەخەوێ
کارێزەکان، بە لەنجەوە چاو هەڵدێنن
باران، پرسەی ماتەمینی باخ و کێڵگەکان دەگێڕێ
لەم ئۆقیانووسە هەناسە سوارەدا

ڕەگی چاومان لە ژێر کەپری بەرسیبەری بەڵامان
لە دایک بووە
ئێستاش، لەسەر پشتی هەور سەما دەکا
ئاگری سەر تەپۆلکەی ئەژنۆکانمان گەش دەبێتەوە
کێ دەڵێ.. هەر ئەمشەو تەرمەکان زیندوو نابنەوە..؟
زەماوەندی خۆرەتاو ناگێڕن...!
ئەو شەقامەی لە بەفر دروست کرا بوو واخەریکە،
هێدی هێدی دەتوێتەوە.
تارماییەکان بەرەو چیا هەڵدەکشێن
داربەڕوو دەست بە چیرۆکی بەر ئاگردانی شەوانەی
دەکاتەوە.
لە بن مەمکی ئەم سپیدەیە، درەختەکان پێ دەکەنن
کانییەکان گۆرانی دەڵێن
داسەکان خۆیان تیژ دەکەنەوە
تەون کارەکان، دەسترازەی نوێ دروست دەکەن



پەپوولەکان، عاشقانە دەم دەخەنە ناو دەمی یەکتری
کەمانچە ژەنەکانیش لە ناخەوە
بۆ سەمای فریشتەیی سەمفۆنیای گوڵ و نان دەژەنن...!

ئابی ١٩٩٤

## سەفەری ڕەهابوونی خەون

### - لەدایک بوون -

ڕۆحی پاکیزەییم
دەسگیرانی فریشتە سپییەکان بوو
ئێستە تاڵاوی مەرگ دەچێژێ.
ڕۆژگارە سەفەرییە گۆبەندییەکان
شەرم لە شیعرە وەنەوشەییەکان دەکەن
کاتێک لەشکری مردووان دەبینین
وتاف لێ دەدەن و دەڵێن
... نامانەوێ بمرین ...*
ئێمە بۆ ئەوە لە دایک نەبووین هەتا بمرین
نامانەوێ نا



بە مردوویش دەمانەوێ بژین...!

### - ماچ -

وەکو پشیلە شێتەکان
لە هەموو شتێک ڕادەکەم و یاخی دەبم
یاخی لە خەونەکانی هەرزەیی تۆ.
یاخی لە خەونەکانی گژو گیا...
دەدەست لە شەمەندەفەری یاخی بوونم هەڵگرە.
من لە یەکەم وێستگەی بە یەک گەیشتنمان
نامەی ماڵئاواییم بۆت نووسی
ماڵئاوا.. ئەی بزە ئەرخەوانییەکانی دەمەو ئێوارانی شیعر
ماڵئاوا.. ئەی دۆژەنە ئەندێشەییەکانی شەوە شەختەییەکان
ماڵئاوا.. گوڵەکەم.
من لەناو ڕووباری «با» ماچم کردی و لەناو دڵی بارانیش دا

دەمەوێ پەرداخی چاوەڕوانیت بشکێنم...!

**- خەون -**

ئەو ژنە مامانەی ناوکی دایکمی بڕی و
ئەو پیاوەی یاسینی لەسەر باوکم خوێند
ئێستە وا بە بەرچاوی منەوە سواڵ دەکەن...!
دوێنێ شەو
منیان کردە پاشاو گەورەی ئەم مەنفایە خۆڵاوییە
دوای چەند ساتێک
کچەکان، لەبەردەم ژوورەکەم دا مانیان گرت
کوڕەکان، خۆیان خنکاند
ئەستێرەکان، چاویان ڕژا.
تابلۆکان، بێ ڕەنگ مانەوە
ئەسپە سپییەکان بەرەو ئاسمان فڕین.
کێڵگە لمەکان بوون بە بەرد...!



سروشت حاشای لە ناوی خۆی کرد.
هەموو زیندەوەرەکان سوێندیان خوارد چیتر زاوزێ نەکەن
ئاخ.. «ڕۆژگارێکی سەیرە گوڵم»...! * *

**- ڕەهایی-**

ڕووت ببنەوە
منیش ڕووتم
با مومارەسە لەگەڵ ئاسمان دا بکەین
ڕووت ببنەوە ڕووت
سروشتیش ڕووتە
با مومارەسە لەگەڵ ڕووبارو «با» و گوڵ و کانی و
لەگەڵ خوناوی سەر لێوی ڕێگاو بانەکان دا
بکەین...!
دەڕووت ببنەوە ڕووت
با هەموومان

هەر هەموومان جلەکانی خۆمان بسوتێنین ،
لە پەنا بەردەکان نان بخۆین و بخەوین...!
دەڕووت بینەوە رووت
با هەموومان...
هەر هەموومان لە کاتی توانەوەمان دا
گوێ لە خورپەی دڵی یەکتری بگرین...!

## - سەفەر -

نیگای چاوت
سەرهەڵدەگرن و کۆچ دەکەن
لەسەر ئارامی باڵی کات ژمێرەکان، دەنیشنەوە
مێژووی رەهێڵە کۆچەرییەکان
تنۆک تنۆک بارانی شکۆی لێ دەتکێ.
چیبکەم،
خۆزگە وەک چۆن سینگم دیواری ئازادە



ئاوهاش پەنجەکانم
بەلەمێکی گەورە دەبوون
تا لە سەفەری بەرەو هەوارگەی رەهابوونی رۆح
هیچ زیندەوەرێکم بەجێ نەهێشتبا...!

*

** هەردوو نیوە دێر ئەحمەدی شاملو

## شەونامەی هەورە سپییەکان

ئەو شەوانەی
تارمایی هەرەمێکی فیرعەونی
وەکو تەونی جاڵجاڵۆکە
لە کەلێنی نێو مەمکۆڵەی سینگی ئەم شارە بێ نازە
دەردەکەوێ و
میلی کات ژمێرەکانیش
لە یەکتری یاخی دەبن.
کرێوەی هەورە سپییەکان
پەنجە لە گەرووی شەو رادەکەن
منیش لەتاو ژانە شیعری شەوم
مەمکۆڵەکان لێک دەخشێنم
ئاگر لە سێبەری خۆم بەردەدەم



ئاخر ئەم شەو
شەوی لە دایک بوونەوەی مرۆڤە...!
لەگەڵ ترپەی دڵی خۆم و
ترپەی دڵی ئەو کەسانەی
لەم شەوە لە دایک دەبنەوە
گوڵە شەوبۆ
لەسەر دڵی بەرد دەروێنم
چاوەکانی گەڵای ئەم وەرزە ماچ دەکەم
لەبەر مۆمی تریفەی مانگ
لاوک و حەیرانی ئەستێرەیی
بۆ باران و گوڵ و درەخت دەڵێمەوە...!
ئەو شەوانەی
ئۆپەرێتی بووکە بە بارانێ ی منداڵان و
گریان و پێکەنینە بێ دەنگەکەی
گەورە کچانی رۆژهەلاتی دێتە بەرگوێم

پەنجەکانم
دەست بە سەمای رۆحی دەکەن
لەتاو ژانە شیعری شەوم
گەڵای شۆڕەبییەکانی چیایی و
قژی رەشی
بەیانییە چاو خەواڵووەکان دەبڕمەوە.
بەنێو شەپۆلە هەڵچووەکانی دەریادا رۆدەچم
برژانگەکانم
دەکەمە سەوڵی بەلەمێکی کۆلۆمبسی
لەم سەفەرە دوور و درێژە لەگەڵ خۆم دا
پەیامی ئارەزووەکانی شیعرم دەگێڕم
ئاخر لەوێ
لە کوندە بەبۆیە چاو تیژەکانی شەو ناترسێم
چاوەکانم
دەبێتە وڵاتی ئەستێرەو



رۆحم
بۆ دەروێشی خولیاکانم دەف لێ دەدا
هەگبەی پیرم
جلی سپی بوکێنی نوێ لەبەر دەکا...!

١٩٩٤/٢/٣

# بژی عەشق... بژی مرۆڤ

پێشکەشە بە: کەژاڵ خدر

ئەو ڕۆژانەی
خەونە سپیدەییەکانی بزە ئەرخەوانییەکانم
لەبەر ڕێژنەی بارانە تریفەییەکان
بە دڵێکی پڕ لە عەشق و بە ئەوینێکی وەنەوشەیی سەمایان دەکرد
باڵا شەنگەبییەکەی خۆزگەکانیشم
لەسەر تەرمی شەوە ئەنگوستە چاوەکان دەبریسکایەوە
نم نم لەگەڵ ئومێدە پەپوولەییەکانم ڕێم دەکرد
ئەو ڕۆژانە چەند بەختەوەر بووم...!
منی خونچەتر لە باڵای شەونمی سەرگەڵا سەوزەکان
منی دڵ گەشتر لە سەمفۆنیای لاولاوەییەکانی شەوە سوورەکانی
ڕووبار
منی دڵ پڕ ئەڤین و جەستە لێواو لێو لە عەشق



عەشقی ساتە ڕەهاییەکانی تەمەن و ئەڤینی تاڤگەی
ئایندەیەکی باشتر
لە ساتە سووربااوەکانی ئەو ڕۆژانەم
دەمویست گۆنای ئەو بەیانییە ماچ بکەم، کە گورزە
ڕووناکییەکەی تێنوێتی نامۆیی دڵیان دەشکاندم
دەمویست لەگەڵ کاروانی ئەڤینداران ڕێ بکەم، بەهەشتە
ئەبەدییەکەی پێش مردنم ببینم و
شەوانان بە ئارامی گوێ لە گۆرانییە بە سۆزەکانی ڕووباری عەشق بگرم
من دەمویست، شکۆفەی عەشقی سەر لێوەکانم بۆ هەمیشە
گەشتر بێت و ڕێژنەبارانی خەونە خۆشەکانیشم بە گوڕتر بن
بەڵام سەد ئاخ..!
کاشکا: ئەو ڕۆژانەم بە چاوەکانی خۆم نە دیبا.
کە باڵایان لە شەوەزەنگ هەڵکێشام و لە نێو تاشەبەردەکانی مەرگ
بەتابووتە ئەبەدییەکانیان سپاردم.
خۆزگە: دێوزمەی مەرگ و ئافاتە ڕەشۆکییەکانم بە چاوەکانی
خۆم نەدیبا کە تیایدا،

ئەشقیاکانی تریفەی مانگ زیندە بە چاڵ دەکران
چ خەزانێکە ساتە تاریکەکانی ئەشکەوتە دۆزەخییەکان
چ شەو مەرگێکە ژانەژینە گۆڕستانییەکانی تەک کێلە مردووەکان
پەپوولەیەک نەبوو، ڕێبوارێک نەبوو
شەوانان گوێ ی لە رازە سوورمەییەکانی دڵم بگرێ
منی خونچەتر لە باران.
ئارەزووم بوو، باوەشم بۆ خۆرەتاوە گەشەکەی حەزەکانم
بکەمەوە
ئارەزووم بوو، لە ژێر سێبەری دارسێوێک رابکشێم و شنەی
نەسیمی ئێوارانیش لەسەر سینگی خۆی هەڵم بگرێ و بم بات بۆ لای
ئەو فریشتەیەی خۆشم دەوێ..
لە رێگادا: میراتگرانی شەوە زەنگی نێو ئەشکەوت و گومبەزەکان
ئەوانەی [عەشق و گوڵ و ئافرەت و ژیان] زیندە بەچاڵ دەکەن
ئەوانەی چاویان بە تریفەی مانگ و بە بریسکەی بەیانیان
هەڵنایێ..
– لاشەیان شەلاڵی خوێن کردم! –



ئێستە دڵم پارچەیەکە لە برین
ئێستە دڵم دەریایەکە لە رق و نەفرەت بەرامبەر بە کەللە پووچەکانی
چەرخە بەردینییەکان
ئێستە دڵم کانییەکە پڕ لە عەشق، بۆ ئایندە
بۆ ئەو بەیانییەی کە لە ساتە شکۆفەییەکانی تەمەنم خەونم
پێوە دەبینی و بۆی دەگریام.
ئێستە دڵم بوخچەیەکە لە گۆرانی و بەهارێکە پڕ لە گوڵ و لێواو لێو لە خەندە
ئێستە من رێبوارێکی ترم.
ئێستە من ئەو عاشقەم، گۆرانییەکانی... کلاراو رۆزاو..
سروودەکانی... جەوهیل... تان بۆ دەڵێم.
وا هەست دەکەم من دووجار لە دایک بووم
ئێستە دەزانم کەوا،
من کەژاڵم من کەژاڵم کەژاڵم کەژاڵ...!
ئەو کەژاڵەم هەست بە رازە وەنەوشەییەکانی دڵم دەکەم
ئەو کەژاڵەم شەوانان سەر بە مەمکۆڵەی شەپۆلە گەرمەکانی
دەریا سپیدەییەکان دەکەم و گەردانە سوورەکانی ئارەزووەکانیشم

تێر ماچ دەکەم.
ئەو کمژاڵەم ڕێگای عەشق و ئەوینم گرتووە لەگەڵ هاودڵەکانی خۆم
داڵدەی ئەو ژنانەین کە شیشەی زیندانە ئەبەدییەکان
لە دیوارە ئەستوورەکان دەردەهێنن و بۆ لامان دێن.
ئێمە لە ماڵەکانمان گۆرانی عەشق دەڵێین
ماڵەکانی ئێمە پڕاو پڕە لە بەختەوەری
ئێمە بەرەو هەوارگەیک دەڕۆین،
لە دەروازەکەی نووسراوە،
ئێرە مەملەکەتێکی ترە... لێرە مرۆڤەکان
بە ڕەهایی سەما دەکەن و پێ دەکەنن و گۆرانی دەڵێن
لێرە عاشقەکان زیندە بەچاڵ ناکرێن، لێرە هەموو مرۆڤەکان عاشقن..!

١٩٩٨/١/٢٥



## بۆ چاوە گەشەکانی ڕەها

کچم ڕەها
چەند ڕۆژێکە هاتی یە دنیا
چەند بە جوانی و چەند بە نەرمی
لەناخەوە پێدەکەنی...!
دەپێم بڵێ،
ئارەزووی ئەم هەموو پێکەنینەت لە کوێ هێنا...؟
دەپێبکەنە ڕەهای دڵم
پێکەنینت، شمشاڵەکەی کۆچەرییانە
پەپوولە یادگارییەکانی باوکم دێنێتە سەما
پێکەنینت،
بەڵندەکانی دەریاو
بزەو خەندە بە ڕێکەوتەکانی دایکمە
لەوەتەری تەمبوورەکەی چاوم دەدا.

کچم ڕەها
کە گەورە بووی بیرت نەچێ
لە ڕۆژانی کۆچەریا هاتییە دنیا..!
ئەو ڕۆژانەی،
ئەستێرە سوورە گەڕۆکەکان
ئاسمانی دەوارنشینی شاریان جێ دەهێشت
شەونمی سەر ڕۆحی گەڵاکانیش
لەگەڵ شیعرە سەربڕاوەکانی شەوانەم
لە زەردەخەنەی بەیانی تووڕە دەبوون
بەدڵتەنگی لێویان لەسەر یەک دادەنا..!
ڕۆحی بابەی..،
ڕۆڵە نەکەی کە گەورە بووی
خوێنی ناو دەمارەکانی
پەنجە ناسکە شووشەییەکەت شەختە بکا.
گوڵە هێرۆی بەرسێبەری،
چاوی گەشی ئەفسوناویت ئازار بدا



لە ژێر کەپری مەزارەکان چۆک دابدەی
لەپی دەستت سەیری ئەستێرەو مانگ بکا.
ئەی خۆشترین سەمفۆنیاکەی
نێو بەهاری گشت تەمەنم
کە گەورە بووی،
من نامەوێ گۆنای سوورت کانی بەهارەی لێ دەربێ
بەردی بن گۆمە وەستاوەکان
بەری هەناسەت پێ بگرێ...!
من نامەوێ،
ڕۆمانسییانە لە ڕۆخ دەریا دابنیشی و تەنها و تەنها
ئەسپە شێتەی غەریزەکانی خۆت ببینی...!
هۆ کچەکەم،
ترپەی دڵی شەوو ڕۆژم
من نامەوێ کە گەورەبووی،
بەفر دەمارەکانی چاوت سڕ بکات
ڕەشەباش گەڵای ناخت بوەرێنێ

بیکەرەوە... ئەو بوخچەیەی لە کۆڵتایە
بەری هەڵدە... ئاسکی نێو قەفەزی سپییەکانت
لێی گەڕێ با... گڕ لە شەپۆلەکانی دەریاو
گڕ لە پەراسووەکانت بەربدەن.
لێی گەڕێ با...
پەردە لەسەر سیمای شەوە تاریکەکان لابدەن
باتریفەی مانگیش لە چاوانت دەربکەوێ.
گوڵە گیان،
بزەی لێوی بەیانیانم
مەترسە...!
کە شەو دادێ خۆری ئاوابووی شەوانەت،
لەبەر باران رووت کەرەوە.
بە لێوانت، قژی زێرینی بەیانیان شانە بکە
نامە قژ سووتاوەکانیش،
لە ئەرشیفی مۆزەخانەی دڵی گەشت کۆکەرەوە.
هۆ رووناکییە نارنجییەکەی خۆرنشینی خەونەکانم



کە شەو دادێ،
دەرگا لەسەر خۆت دامەخە... لە بینینی ئەستێرەکان بێزار مەبە
ئەوە هەورە رەشەکانن کڕێوەو زریان هەڵدەکەن
دەیانەوێ،
لەسەر نەخشەی شاری رازاوەی هیواکانت
شەقامەکان بسڕنەوە.
مۆری چارەنووسی نادیار
لەناسنامەی عەشقت بدەن
کچم ڕەها
ئەو شەوانەی
نیگای شەرمت
چاوی شەرمت
رۆحی شەرمی زەوی ناخت
تێنوی دەستڕێژی
بارانە
دەرگا لەسەر خۆت دامەخە

لێ ی گەڕێ با:
گڕی عەشقە سووتاوەکەت دابمرکێ و کەزییەکانت
لە گەردن و باڵای شەوت بئاڵێنە...!
گوڵە گیانم...
دەرگا لەسەر خۆت دامەخەو
پەنجەرەکانیش با لەسەر پشت بن..!

١٩٩٤/٣/٢٥



## ڤینۆس

(١)

لەگەڵ بزەی خەمە مرواریەکانم
بۆ ناو ناخم شۆڕدەبیتەوە
لەگەڵ گەمە بێ دەنگەکەی ساتە لاشعورییەکانیشم
کڕنووش بۆ باڵات دەبەم
ئاوێتەی حەزە ڤینۆسییەکانت دەبم
ئەمشەو: دەمارەکانی تامەزرۆییم سەمایان دەکرد
لەگەڵ ساتە ئەڤینیەکان هاودەم بووم
لە جیهانی وەیشومەیی چوومە دەرێ
لە غوربەتی بێ تۆییدا،
لەگەڵ شنەبای بەفری نێو ناخم گۆرانیم دەگوت

ئەی ڤینۆسی من ... ئەمشەو
ماڵەکەم بێ تۆ غوربەتخانەیە
ماڵەکەم بێ تۆ بە مۆسیقای تەنیایی هەناسە دەدا.
ئەمشەو من و کات ژمێرەکەم و کتێبەکانم پێکەوە دەگریێن
[.. لە دوورەوەش نەهاتووین، تۆزی غەریبی لە سیمامان نیشتووە..!]
لە ساتە ڤینۆسییەکانم
لە ساتە بێ تۆییەکانم... مەرگ بە رووتی لە ئامێزم دەگرێ و
مەمکەکانی خۆی لە سینگم دەخشێنێ.
لە نێو عەشقە تاوسییەکانیشم هەمیشە سەمفۆنیا چرپەییە پەمەییەکانت
لە گوێم دەزرنگێتەوە.
نامۆیی خۆم لە پەنجەرەی یادگارییەکانم دەبینم
ئەی نەورەسیتر لە شەرابە ڤینۆسییەکان
لێم گەڕێ: با هەردوو لەپی دەستەکانم
بکەمە جێ راوگەی نم نمەی باران و شەپۆلە سوورەکانی ئەڤین
لێم گەڕێ: با هەورە سپییەکان لە ئاسمانی دڵم هاتوچۆ بکەن



با بە عەشقت بیلاوێنمەوە.
ناخە شەرمناوییەکانی عاشقۆڵە لێو بەخەمەکانی نا ئومێدی
با ماچ بکەین گۆنا هەنارییەکانی رووبارەکان و تاڤگەکان و کانییەکان

١٩٩٨/٢/١٩

(٢)

ئەم ساتە قورمزییانە ڤینۆسییانە یادگاری تەمەنن تەمەن
لە عەبەسی بوونی رووبارو عەشقە شێتانەکەی خۆم
ختوکەی پێکەنین بەلەشم دادێت.
من لە بژوێنی عەشق، یەکەم دیوانە شیعرم خوێندەوە
بە گۆرانییە تاڤگەییەکان و بەگەمەکانی خۆرەتاو ئاشنا بووم.
ئەی پاساری تر لە شکۆفە بەفرینییەکان
لەهەر کوێ بم،

ئەو پاسانەی پڕاوپڕن لە یادگاریە ڤینۆسییەکان
رۆژانە بە شەقامە درێژەکانی دڵم دەسوورێنەوە...!
دەبا بڕۆین... بۆ ئەوپەڕی دنیا بڕۆین...!
هەموو شوێنێک بکەین بە مەنزڵگەی عەشق
شەوانان: تا گۆش دەبێن سەما بکەین...!
ئەی ڤینۆسی من...
چەند شیرینن ئەو شەوانەی مۆمی بەیەک گەیشتن دەلاوێننەوە
مۆم پیرۆزە وەکو شیعر.
من لە گریانم دا لاسایی مۆم دەکەمەوە.
گوڵە گیان:
لێم گەڕێ... با گڕ لەو ناخە درەختیانە بەربدەم
کە دەیانەوێ لە هەوارگەی دڵمان چرا هەڵکەن
لێم گەڕێ... با خۆم بدەمە بەر ئەو تاڤگەیەی
کە شەوانان گۆرانی عەشقم بۆ دەڵێ.
گوڵە گیان:



ئەمشەو شەرابی ڤینۆسیم خواردەوە
ئەو شەوە سووریاوانەم خۆش دەوێ
کە دڵم بەختەوەر دەکەن و عەشقە ئەبەدییەکانیش لە دایک دەبن...!
ئەو شەوانە شەوی لە دایک بوونی منن...!
بەرزو بەڕێز بێت... شەوە ڤینۆسییە سووریاوە ئەڤینییەکان...!

١٩٩٨/٣/٢

## سەفەری ئاگر

لەناو شەپۆلی دەریا
بۆ نغرۆ بوونت دەسووتێم ئەی ئاگر
پێکەنینم بە جلە کۆنەکانی زەمەن دێت
نازانم لەمەودوا،
بۆ غەریبی خۆم بگریێم یان بۆ تۆ...!؟
ئەی موغانە مەریەمییەکان
لە بێدەنگی مانگ دەرس وەربگرن
کاتی راموسان بەسەرچوو
مەمکەگەرمەکان ووشک بوون
شەهوەتی باران و گژوگیا بوون بە خۆڵ
سەردەربێنەوە ئەی ئاگر
کڕنووش بۆ مەقاوەمەتی کارێزەکان بەرە



سەردەربێنەوە ئەی ئاگر
با ئاوە شەختەییەکان شڵەتێن بینەوەو
کڕنووش بۆ مەقاوەمەتی ماسییەکان بەرە
یادگارییەکانی «من و ئاگر وبا» وەکو یەکن
من دەفتەری یادگارییەکانی خۆم سووتاند
خۆڵەمێشەکەییم کردە بخورێکی گیایی
لە گۆڕستانەکانی ئاگر،
ئێستا یەک پارچە بخوری یادگارییەکانی منە دەسووتێ...!
سەردەربێنەوە ئەی ئاگر«با» هەڵهەڵەی لەدایک بوونەوەت بۆ لێدەدا
دارستانەکان و هەورە تریشقەو هەموومان لە پێشوازیت داین.
ئای لە بێگوناهیمان
سەردەمانێک، خەونە ئاوریشمییەکانمان
لە خەونی «تاوس»ـە وەهمییەکان خۆشتر بوو.
«من و پەپوولەو هەور» هاوڕێی مەشخەڵە شێتەکان بووین...!
ئای لە بێگوناهی زەمەن

سەردەمانێک، مەزنترین و ئەوینترین عەشقمان
لە چاوەکانی «با» دەخوێندەوە
کاتی راموسان بەسەرچوو.
«ئاگرو با» لە مەنزڵگەی جاویدانی کوژانەوە.
لە نێوان نغرۆبوونی ئاگر و بەرائەتی وێرانبوونی
عەشقە مەزنەکان
کەپرێکمان بۆ خۆمان دروست کرد.
هەنگاوەکانمان لەسەر پشتی درەختەکان گۆرانی ناڵێن.
خۆزگەکانیشمان ژەنگیان هەڵێنا.
من فێردەوسیم
لە وەختە سەرەمەرگییەکانی ئاگر شیعر دەخوێنمەوە
جریوەی ئەستێرەو شەپۆلی مانگ.
پێدەشتەکانی ناخم سەوز دەکەن
پێکهاتەی ناو لەپی خۆرەتاو دەبینم...!
ئاگر مرد، بەهار مرد، رووبار نەمرد



زەمەن مرد، خەون مرد، عەشق نەمرد
«با» مرد، درەخت مرد، شیعر نەمرد
زەمانێکە ئەو لاوکە سەفەرییە گوێی کاس کردووین
زەمانێکە،
پەنجەرەیەک رووناکی لە چاومایە
ئەودیو خۆرنشینی عەشقی پێ دەبینم
من فێردەوسیم
تێنوێتیم بە فرمێسکی ئاگر دەشکێ
من ئاگریم
لە شەوانی ئەنگوستەچاو ژان دەمگرێ
سەر دەربێنەوە ئەی ئاگر
بۆ دەوارەکانی ئەودیو ئاسۆو
مەنزڵگەکانی ئەستێرە بروانە موحیبەت وا لەوێدا.
سەر دەربێنەوە ئەی ئاگر
لە ئارامی ناخی پەلکە زێرینەو

سەمای پەپوولە موغانییەکان بڕوانە،

چراخانی عەشق وا لەوێدا.

سەردەربێنەوە ئەی ئاگر

«با» هەڵهەڵەی لە دایک بوونەوەت بۆ لێدەداو

دارستانەکان و هەورە تریشقەو

هەموومان دەست لەسەر سینگ لە پێشوازیت راوەستاوین...!

زستانی ١٩٩٦



## گۆرانییەکانی بەیاتریس

بۆ: (هاشم سەڕاج)ی شاعیر

لاکێشەیەکی پڕ پێکەنین و

سێ گۆشەیەکی بوومەلەرزەیی

بازنەیەکی بێ دەنگ و

شەش پاڵوویەکی پڕ شەهوەت، ناونیشانمە...!

لە دارستانە چڕەکەی شیعر

هەموومان بە دۆزەخ سپێردراین

پەنجەرەی ڕۆینەکانمان لەسەر پشتن

بە لێوی کام فریشتە ماچم دەکەی...؟

دەرگای عەشقگەکانمان داخراون

بە پاکیزەیی کام گوناه سوێندم دەدەی...؟

ئەگەر هەر لە وڵاتی مەرگ بمێنینەوە

به فرمێسکی کام سەحەر دەمشۆی...؟
ئەگەر لە گەمەی ڕەنگەکان تەواو بین
بە مەمکی کام وەرز ڕەنگڕێژم دەکەی...؟
تۆ هاوژینت خۆش دەوێ و منیش ئەڤین
تۆ باسکە کوتراوەکانت خۆش دەوێ و
منیش مەچەک سپییە سورمەییەکان
پاقژگە پەیژەیەکی ماوە بۆ بەهەشت
«ئەگەر مەرگ مەودا بدا» لە بەهەشت یەک دەگرینەوە.
خەرەندە تاریکەکانی نامۆیی و شەقامە نارنجییەکانی خەیاڵ
لە بن نووکی قەڵەمەکەم بەیەک دەگەن
پیتە رووتەکانی پەیڤە مردووەکان لەناو بەلەمە ئەلماسییەکەی
دەریا ڕاکشاون.
کچە دەرگەوانەکەی دۆزەخ،
تەهلیلەی خۆشی لەسەر لاشەی شەوە سوورەکان لێدەدا.
بە پاکیزەیی کام سەحەر داڵدەم دەدەی...؟
دوێنێ شەو:



بەرداخێک لە لیکی نێو دەمی ئەڤینم خواردەوە
بۆنی شەربەتە پرتەقاڵییەکەی بەهەشتم گرتووە
ئەمشەویش:
تاوسێکی شینی دامێن ڕەنگاڵەیی هاتە خەونم
لە خۆم دڵتەنگ تر بوو... بۆ چەند ساتێک بەیەکەوە گریاین
فرمێسکی تاوسەکە شین شین بوو، فرمێسکەکەی منیش پەمەیی
دەبا لە بەرداخە بەنەفسەجییەکان
هێندە شەڕابی عەشق بخۆینەوە، تا ڕۆحە تاوسییەکانمان
مەست دەبن و پەیڤە گوناهبارەکانی بەهەشت دێنە قسە.
دەبا بباریێ بارانی تلیاک و گوناه
با قۆرتێ نێو مەمکۆڵەی گیا تەژی بێ لە یادگاری
ئەی فریشتەتر لە شەونم
دەبێ کێ بێ یەکەم جار:
ووشەی خۆشەویستی و «ئاو» و سەمای داهێنابێ...!؟
دەبێ کێ بێ یەکەم جار:
بە ترۆپکی خۆشەویستی گەیشتبێ و زایەندەترین ماچی کردبێ...؟

دەبێ کێ بێ یەکەم جار:
لەناو شەپۆلی لەزەت توانەوەی رۆحی بینیبێ...!؟
وشە سپییەکانی باخچەی رۆناکی،
تەنها لە ئەلبومی شیعر جێی دەبێتەوە
خۆڵەمێشی یادگارییەکانمان،
لەناو وێرانگەی جەنگ لەگەڵ گێژەلووکەی گەردەلوول سەرمەستن
لە بەهارگەی رۆحمان گەڵا سەوزەکان هەڵدەوەرن... خەزانگەیە خەزانگە
لە دەڤەری شمشاڵە کریستاڵییەکان
خەزانگەی خەزان بەهارگەی بەهار دەلاوێنێتەوە
رۆندک رۆندک، شەونم شەونم باسک و مەچەکی ئارەزووە شووشەییەکان
لە باڵا شەنگەبییەکەی خەم دەئاڵێن.
چ نەشئەیەکی هێمنە،
سەمای مەرگە ئەرخەوانییەکانی گۆرانی
چ رازێکی تەڕو بریسکەبییە، لاوکە بریندارەکەی خەونە ئاوێنەییەکان
گوڵە فریشتەییەکانی بەفر بوون بە ئەفسون
گوڵە ئەفسونە فریشتەییەکان بوون بە بەفر



گوڵە بەفرینە ئەفسوناوییەکان بوون بە فریشتە
ئەی ئەفسون تر لە عەشق
دەبا بباریێ رۆندکە سپییەکانی ئاسمانە پەپوولەییەکان
دەبا ئەفسون تر بێ دووچاوە مەستەکەی کچە دڵ بەخشندەکانی
رۆژهەڵات
ئەمشەو:
بەیاتریس سەمام بۆ دەکات و تاوێکیش گۆرانیم بۆ دەڵێ.
وادەی سوتاندنی دارمەیتەکانە، با خۆمان گەرم بکەینەوە.
مەڕۆ ئەی بەیاتریسی بەفر
ئەمشەو دەمەوێ لە ئارامگەی سەر لێوت سەرخەوێ بشکێنم
ئەمشەو مۆسیقا هێمنەکەی بەفر بەیاتریسی عەشق رادەژەنێ و
بەرداخە شەرابییەکەی دەستمان پڕ ئومێد دەکات
دەمەڕۆ ئەی خوداوەندی شیعر.
ئەم عەشقگەیە ئێوارە شیعرو رەقسی بەیاتریسی و
مۆسیقای دەریایی دەوێ.
گۆرانییەکانی بەیاتریس..

چ شەوێکی سەرمەدی و خەندە ئامێزو جاویدانترە لە ئەفسون...!
تەنیایی گۆشەیەکە لە مردن...!
دەبا بباریێ بارانێک لە سێو... با خۆمان تەڕ بکەینەوە
گۆرانییەکانی بەیاتریس لە کەنار «دەریای سێو» بە جۆشتر دەبێ
لە چاوەڕوانی سێوێکی لەت لەتی فیردەوسی خەریکە شەق دەبەین
ئەی گوڵەگەنم تر لە بەختم
سەفەرەکەم دوورو درێژە...
لەناو لم ولیتاوی ئەستێرەی کاروان کوژە دەگەوزێم
دەفریام کەوە
پەنجەرەیەک لە مانگ و دەریایەک لە خۆرم پێ نیشان بدە...!

ئەیلوولی ١٩٩٧



## مەملەکەتی عەشق

لەوەتەی بە بیرم دێ
ئەلەنگی گەرووم هەمیشە دیارەو
ئاونگی سەردرەختی پەنجەکانیشم هەموو بەیانیان
دەگرییێن.
«... لەو ڕۆژەوەی
شیعر تێنوێتی دەمارەکانی ڕۆحم دەشکێنێ
هەموو کونە بچکۆلەکانی پێستم بوونەتە کانی عەشق
بۆیە هەموو شەوێ
گەر قاپێک شیلەی گوڵ و بەرداخێک شەڕابی عەشق نەخۆمەوە
دەبێ خۆم بکوژم.
من لە مەملەکەتی عەشقەوە هاتووم
بە بۆکرووزی ئەم پێدەشتە سییەکانم ڕەش دەبێ.

هاتووم هەناسە بهێنمەوە بەرگوڵە گەنم و
درەختەکانی عەشقیش متوربە بکەم...!»
لەم سەفەرەم پەشیمانم،
غەریبی مەملەکەتەکەی خۆم دەکەم
رانەهاتووم لەسەر سینگی وردە بەردە تراویلکەدارەکان بژیێم
نابمە لاوک بێژی بەر بەردینەی قەدپاڵی چیا
من  لە شەوانی تارو ئەنگوستەچاو
هاتووم ببمە ئەستێرۆک و ببمە ئاڤژەنی بەلەمی
پڕ خۆزگەی رۆحتان.
هەستنە سەر پێ من پەیامی عەشقم پێ یە
ئەمشەو هەموو نهێنییە گەورەکانی بوخچەی دڵم دەدرکێنم
هەستنە سەر پێ مژدەی شەوی بەراتی مەملەکەتی نانم پێیە
کلیلی دەرگا داخراوەکانی ئاسمانم هێناوە
ئەمشەو هەور ئاهەنگی ئازادبوونی خۆی دەگێرێ
منیش، بەسەرهاتی نان و عەشق و سەرابی



ئەم مەملەکەتە دەنووسمەوەو
نەخشەی گەڕانەوەش بۆ هەوارگەی لە دایک بوونمان دادەنێم...!

ئابی ١٩٩٥

## شەوە بێ نوێژەکان

شەپۆلە ئیرهابییەکانی گومان
لە دڕاندنی پەردەی کچێنی شەوە نەوڕەسییەکان
بێزار نابن
ڕۆحی من وکات ژمێرەکانی ئەم وەرزە
لە خۆرنشینی ئێوارەو لەزەردەپەڕی بەیانی یاخی بوون
بەسەر پشتی باڵندە ئاوییەکان شۆڕبوونەتەوە.
لە ساتە ناوەختییەکانی تەمەنم
بە لاپەڕە سەرەتاییەکانی ئەم کەونەدا دێمەوە
لەناو بزربوونی خۆم،
لە پەنجەرە هەتاوییەکانەوە
لە خەونی تریفەی مانگەشەوە زیندانی کراوەکانی
لە دایک بوونم رادەمێنم.
پێشنیهادەکانمان درۆ دەرچوون



گەڕانێکی دۆزەخی بەسەر تخوبێکی چەماوەیی
بەدیار ئاگری پێکەنین و گریانە گوناهبارەکان دووبارە دەبنەوە
ئەو دەرگایەی من لێ ی هاتمە ژوورێ بە دوامەوە داخرا
با دەرگای پێش هاتنی مێژووی چەرخە بەردینییەکان
بکەینەوە.
لە مەرگی بارێزەکان بڕوانین کە چەند تەڕ بوون
هەموو دەم زەماوەندی سێبەرو هەتاو دەگێڕدرا.
ئەی زیباترین فریشتەی بەرائەتی بوون
دەمەوێ بێمە خزمەتت
چیرۆکی روخسارە بەنەفسەجییەکانت بۆ بگێڕمەوەو
سەرەتایەکیش بۆ ئەفسانەی دوارۆژەکانی مانگ و
دواساتەکانی ساڵ بنووسم.
ئافاتە ئافات... لەگەڵ شەوە بێ نوێژەکان راهاتووین
سەفەرە سەرابییەکانیش چاوەڕێمانن.
توانەوەی خەوە شەیتانییەکان تەواو بوو
سەرەتای مردن و کۆتایی لە دایک بوونە ئەبەدییەکان

دەمێکە لە زاگەی ڕۆحمان دەپیترێن...!
ئافاتە ئافات... سەرەتاو کۆتاییەکان بەیەک گەیشتن
لەگەڵ ڕۆژگارە سەهەندییەکان ڕاهاتووین
ڕەهەندە ڕۆندکیەکانی لەپی دەستمان نابڕێنەوە
توانەوەی خەوە فیردەوسییەکان تەواو بوو
شەوە زاڤانییەکانیش بە سەرچوون،
ئیتر ناگەڕێنەوە .........!

مارسی ١٩٩٧



## جەنگ *

لەبەر ڕێژنەی ئەزەلیترین ژوانی بەربارانی جەنگ
سۆلاڤیترین فرمێسکی خۆڵەمێشیم بە دیاری
بۆت بە جێ هێشت.
ژوانی کەنار دەریای ئەڤینم بەسەرچوو
لێم گەڕێ: بەلەمی فەنابوون چاوەڕێیە
ماڵئاوا: چرکە ئەڤینییەکانی عەشق
ماڵئاوا: خەونەکانی منداڵیم
دەڕۆم.. ڕێژنە بارانی جەنگ بۆ ئێوە
دەڕۆم.. شەپۆلە شینەکانی دەریای جەنگ بۆ ئێوە
شەوە ئەنگوستە چاوەکانی جەنگ بۆ ئێوە
من و عەشق، من و شیعر
من و گوڵە گەنم و پنجە گیا

**من و رووباره سپییەکان**
**لە شوێنێکی تر ژیان دروست دەکەینەوە.**

* ئەم شیعرە لە ١٩٩٧/٦/٢٠ لە«نادی اعلام» بە چارەگە سەعاتێک نووسراوە ئەزموونێکی شیعری د.فەرهاد پیربالْ بوو کە ژمارە «٥»ی گۆڤاری (وێران) تایبەت بوو بەم ئەزموونەو دەقە شیعرییەکان بڵاوبوونەتەوە.



## گۆرانی ژانێکی بەردەوام

**لە ژێر تروسکایی فانۆسە کزەکەی**
**ژێر گۆڕستانی هەنگاوەکانم**
**لەگەڵ درێژبوونی نینۆکەکانی**
**کۆڕپەی خەونە شینەکانی شەوی پاییزم**
**لەگەڵ کەژاوەی**
**تارمایی و مەرگی ئاوازە پچڕاوەکان**
**گوێم لە مۆسیقایەکی ئارامەو یاغر یاغر**
**پەپوولە سپییەکان دێن لەسەر گوڵزاری ڕۆحم**
**دەنیشن.**
**هەموو تەمەنم،لەناو ئەو گۆمە بەسەر بردووە**
**کە پڕە لەلێکی ناودەمی شاژنە بێ شەرمەکان و**
**پڕە لە تلیاک و پڕ لە شەڕابی نەزۆک بوونە**
**حۆرییە بە هەشتییەکان،**
**بە رووتی لەناو ئەم گۆمە مەلە دەکەن**

منیش له نێوان کابووسی خەوی شەوانەو
لەزەتی بەستەی ئارەزووەکانی رۆحم،
گۆش دادەمام و پرسیارەکانیشم بێ وەڵام دەمانەوە
جەنگەڵستانەکەی ناو سەریشم تا دەهات ئاگری
خۆشتر دەبوو.
تا دوێنێ عاشقێکی نامۆ و گرینۆک بووم
هەموو پەنجەرەکانی ژوورەکەی خۆم داخستبوو.
لەنێو شەپۆلی رووباری بن زمانی گەورە کچان و بێوەژنان دا
دەخنکام و گوێم لە ورشەو هاژەی تاڤگەی برینی
کورو کچانی دڵ بە سۆش نەدەبوو...!
بەڵام ئێستا، رووتم کراسی شەرمم داکەندووە.
هاتووم سەمفۆنیای رەهابوونی حەزەکانتان
بلێمەوەو لێو و مەمکی خەونەکانیشتان تێر بمژم.
من نوزەو قاقای
گۆرانییەکانی دوێنێ و ئەمرۆ و سبەم
چیتر لە ژێر چەتری چاوەڕوانی باوەشک نادەم.
من ئەو عاشقە دڵ تەڕەم



دەمەوێ بێ چەتر لە ژێر رێژنەبارانی بەهار بێم وبچم
بۆنی خۆڵی پاش ئەو بارانە هەڵمژم
کە ختوکەی رۆحم لەگەڵ سەمای خۆرو
نەغمەی رووبارو بزەی بەیانیان دەهێنێتە جۆش.
من دەرچووی قوتابخانەی مەرگم
خەونە بەهارییەکانم لە کۆڵە
پەنجەرەی دڵتان لە رووی عەشقما با ئاوەڵابێ.
من تامەزرۆی نیگای گەرم و چاوی بە خوماری
پڕ ئومێدتانم
دەپێم بڵێن، کێ سوارچاکی شکۆمەندی ئەم لە دایک بوونەم
دەنووسێتەوە..؟
کێ یەکێ دەبێتە بتهۆڤن و دەبێ بە کۆڕال و ئەم
گۆرانییە،بەردەوامە لەگەڵ منا دەڵێتەوە...!؟

مارسی ١٩٩٥

## لە نێوان من و بەرائەتی ئاو... زەمەنێک لە عەشق

پێشکەشە: بەو موسافیرانەی لەدەریای
(ئیجە) گیانیان لە دەست دا

ساتێک لە نێوان هەڵپەرکێی مەرگ و مردنی خەونە پەمەییەکان
لاوکە بەرپێژنەکانی گوڵ،
لە قیژەو هاوارو خەون بینینی سروشت بێداری کردمەوە.
ساتێک لە نێوان سەفەری پەنجە هەڵوەریوەکانی رۆحم و
بزربوونی لەتێک لە مۆسیقا دڵگیرەکانی منداڵیم
ئومێدە خۆشەکانم خۆیان دایە دەستی رووبارە خۆڵەمێشییەکان
ئێی سەفەر
چۆن بزە ئەستێرەییەکانی چارەنووسمت بەوەیشومەیی دەریا سپارد
چۆن ساتە ئارامییەکانی دەریات بە خۆڵەمێشیترین خەندەی
زیندە خەوەکانم سپارد



لە نێوان من و بەرائەتی ئاو، زەمەنێک لە عەشق
گۆرانییە کوکوختییەکان دەڵێنەوە.
زیکرە دارسنۆبەرییەکان نمایش دەکەن
کوڕو کچۆڵە عاشقەکان بە دزییەوە ماچە شەهوەتییەکانیان
بە دیاری بۆ یەکتری دەنێرن.
ئێی دەریا...،
شەپۆلەکانت بێ ئاگا لە خەوی شیرین دا بوون
رووت رووت لێی راکشابووی.
بارانە کۆڤانییەکانی قەدەر بوو قەدەر، لە خەو رایان چلەکاندی
ئێی ئیجەی گوڵ.
هەر دوێنێی دوێنێ بوو، لەزاگەی تۆ هاتمەسەر
ئەو هەوارگە وێرانەیە.
لە نێوان من تۆدا، زەمەنێک لە عەشق
لە گەردنمام ئالاوە
بەهەشتێک لە یادگاری
دۆزەخێک لە رووداو

دەریایەک لە لەزەت
ئاسمانێک لە گوناه
من پیاسەی ئێواران و ساتە راموسانییەکان و
گەوز گەوزێنی نێو زیخ و لم و توانەوەی ژێر چەترەکانی
کەنار دەریام قەت بیر ناچێتەوە...!
ئەی دەریا ئەی مەملەکەتی بەرائەت... دەپێم بڵێ ...؟
کێ لە هاوکێشەی هاتنی من و تۆ تێ دەگات تەنها خۆم نەبێ؟
کێ لە نهێنی زمانە نەدۆزراوەکانی من و تۆ تێ دەگات تەنها خۆم نەبێ؟
موسافیرەکان... لەبەر دەرگا دۆزەخییەکانی وەهم دەرشانەوە
نەفرەتیان لە گوڵە پایزییەکان و عەشقە پایزییەکان دەکرد.
نەفرەتیان لە فیردەوسی وەهم و نیشتمانی وەهم دەکرد.
ئێی ساڤۆ گیان..!
بە هاوارو حەسرەتەوە بەرەو فەنابوونی ئەبەدی و
بەرەو خەوە شیرینەکانی ئەبەدی رۆیشتی.
نەفرەتت لە نیشتمانی شەڕو خەونە سەرابییەکانی وەهم کرد
ئێمە لە سێبەری حەسانەوەمان،



عومری خۆمان بە سپیدە نەهاتوەکان بەخشیوە.
هاوارە هاوار، موسافیرەکان مردن
زارۆکەکان ناگەڕێنەوە..!
فریشتەیەک نەبوو نا ،
موسافیرەکان سکێچی خەونە نارنجییەکانیان بوو بە خۆراکی ماسی
هانایەک نەبوو نا ،
موسافیرەکان... سکێچی خۆزگە پەمەیی یەکانیان بوو بە کەڤاڵی
مەرگ و فەنا بوون.
موسافیرەکان یاخی بوون،
یاخی بوون لە رەشەبای گۆبەندی و لەشەوە کابوسییەکان.
یاخی بوون لە یاخی بوونی باران و تاڤگەو چاوە خەواڵووەکانی سپیدە
یاخی بوون لەسەر خۆش بوونی پەلکەزێرینەو
لە شێتییەتی هەورە تریشقەو زریان و کڕێوەو بەفر
دەستەی یاخی بووەکان رۆیشتن رۆ
نەفرەت لە بەهەشتی سەر تەنافی مەملەکەتی شەڕ
نەفرەت لە خەونە کریستاڵییەکانی سەر تاشەبەردی تووتیستان.

موسافیرەکان ڕۆیشتن...
مەتارەی ئاویان پڕ لە خەون و ئومێد بوو.
لە دوا ساتەکانی ڕۆیشتنیان
کاتێک کە پەپوولەو پەڕەی گوڵەکانیان ماچ دەکرد.
چاوەکانیان پڕ بوون لە فرمێسک و نیازی دیدار
چ دیدارێک بوو دیدار...؟
ئاوێنەکان شکان، پەلکەزێڕینە گۆرانی مەرگ و
مەرگ گۆرانی پەلکە زێڕینەییمان بۆ دەڵێ
وەی گیان موسافیرەکان ... مەدالیای جاویدانیتان پیرۆز بێ
ماڵئاوا موسافیرەکان ... مەملەکەتی بەرائەتتان پیرۆز بێت...؟

١٥ی ئابی ١٩٩٧



## ئەڤین لە کەڤرستانی مەرگ *

(خۆزگە عەشق زمانی با، وەقسە هاتبا....)
ئەحمەدی شاملو

ئەی شەونمیترین شەونمی مەملەکەتی گیا
من لە کەڤرستانەوە هاتووم، لە سیبیریاترین سیبیریای دۆزەخی
دە بە هەناسەت باوەشێنم کە،
بە ڕۆحی ڕووت و بەمەمکی پڕ لە عاتیفەت دامپۆشە
منیش ئەمشەو چیرۆکی مەریەمیترین عەشقت بۆ دەگێڕمەوە
ئەی ڤینۆسیترین بەلقیسی ئەڤینی
دەبەگەڵای ماچ باوەشێنم کە، بە کاژی عاتیفەییت دامپۆشە
ئەمشەو بۆ ناوناخی دەریاو ئۆقیانووسەکان شۆڕدەبینەوە
دەبین بە بنیادەمێکی ئاوی.

**دیلانێ لەگەڵ ماسی دا دەکەین.**

**ئەی ئاورینگترین ئاورینگی ئەڤینی، لە کەڤرستانەوە هاتووم**

**راسپاردەی گوڵە پەژموردەییەکان و کچە سەربڕاوەکانم هێناوە.**

**خەوە ئەسمەرییەکانی ئەو کچە گۆدۆییانەشم هێناوە**

**کە لەناو لم دا دەگەوزان و وڕێنەیان دەکرد.**

**ئەی کچی ئاورینگتر لە ئەڤین**

**بارانی هەورە قەترانییەکان دەبارێ و وەرە ژێر ساباتی رۆحم**

**با زێتر سیمای فریشتەییت نەشێوێ.**

**دەوەرە باسی کۆنە ئەشکەوتەکانی کەڤرستانت بۆ بکەم.**

**کە کەڤرێژن لە لووت و مەچەک و مەمک...!**

**لێرە ئەڤینی لە خواردنی سێوە قەدەغەکراوەکان قەدەغەترە.**

**لێرە ئەڤینی لە خواردنی سێوە گوناهبارەکان گوناهترە.**

**چەند گوناه بوون ئەو کچۆڵانەی بە بێهوودەیی مردن و ئومێدەکانیان**

**بێ ناز مانەوە**

**چەند دڵ پڕ کەسەر بوون ئەو ژنانەی بە بێ ئومێدی مردن و**



**کاشکاکانیان بێ هودە مانەوە.**

**دەتوخوا ئەم گیانبازانە بە ئاوی عەشق بشۆن**

**بە ئارامی جەنەتی عەشقیان بسپێرن.**

**لێیان گەڕێن،**

**با بە هێمنی لەباوەشی خوداوەندی عەشق بخەون.**

**دەتوخوا ئەو گیانبازانە بە فرمێسکی ماسییەکان بشۆن**

**لێیان گەڕێن،**

**با پەپوولەکانی عەشق بە ئارەزووی خۆیان ماچیان بکەن و**

**لەسەر گۆناکانیان تاوێک ڕابکێشن و تێر تێر بۆنیان بکەن.**

**ئای چەند گەوج بووین خۆمان بە سەرشێتی زریان و بەبێ ئەمەکی**

**گەردەلوولەکان سپارد. بۆیە نامرادانە مردین.**

**ئای چەند گەوج بووین گەوج، خۆمان بە ئەفیونی دەریاو**

**شەپۆلە نەزۆکەکانی سپارد.**

**بۆیە بێ ئاگا بووین لە دۆژەنی مەرگە دۆزەخییەکان.**

**بێ ئاگابووین لە چارەنووسی بێ ئاگایی نێو خەراباتی بێ گوناهیمان**

ئەی ئەڤیندارترین ئەڤینداری ئەڤینی
عەشقبازە زیندە بەچاڵکراوەکانی دوێنێمان، ئەمڕۆ لە بەهەشتی
ئۆقیانووسەکان بینی.
گلەییان لێمان دەکرد
ئای کە لەوێ بەختەوەر بوون بە ئارەزووی خۆیان
ئاشقانێیان دەکرد.
ئەی ئەڤینم لە ساتە زێڕینەکانی مێژوو لەدایک بووم
بە پەیژەی پەراسووەکانم هەڵگەڕێ،
با بتگەیەنمە جێ ژوانگەی ئەڤینی
ئەی ئەڤینم مێژووم پڕاو پڕە لە سەرفرازی،
دەدڵی خۆتم بۆ رەهاکە، وادەی ماسک نەماوە نا...!
دوێنێم کەڤرێژبوو لە مردن بەسەر چوو بە من چی...؟
دوێنێت کەڤرێژبوو لە کەڤر بەسەر چوو بە تۆ چی...؟
چ وادەی گریانە ئەڤینم لەلای من بەهارەو کەرنەڤالی سەمایە
بە پەیژەی پەراسووەکانم هەڵگەڕێ، رۆحم بەردەبازی نێو رووباری



رێی ئەڤینە
با پێکڤە سواری ئەسپی تریفەی مانگ بین
با پێکڤە برۆین -پێکڤە- دەی دەبا پێکڤە برۆین.
جێ راوگەی عەشق بکەین بە ماڵمان.
کەرنەڤالی سەما بکەین بە ماڵمان.
ئەی ئەڤینم من ئەڤینترین ئەڤینی نێو ئەڤیندارانی ئەڤینم
دەوەرە بۆت دەبم بە مانگ، تا تێنوێتی دەمارەکانی ئەڤینیت بشکێنم
دەوەرە بۆت دەبم بە کانی، سینگم بۆ شەونمی سەر گەڵای
ئەڤینیت ئاوەڵا دەکەم.
ئەی شەونمیترین شەونمی مەملەکەتی گیا.
دەوەرە بە ماچ کاژی نێوانمان بدرێنین و ئاوێتەم بە
دەوەرە بە گوڵ مێژوومان بنووسینەوەو ئاوێتەم بە
ئەوە فەرهەنگی کەڤرستانی دوێنێ بوو نەی دەهێشت
من و تۆ ئاوێتە ببین.
چەند دڵخۆش دەبین دڵخۆش،

**ئەگەر لەناو تاسەی ئاوێتەبوونی عەشق بمرین، دە زێتر ئاوێتەم بە لێرە ئارەزووەکانی ئەڤینداران**
**سەرنابڕدرێ و رەشماڵیش لە پرچی**
**ئەڤینداران دروست ناکرێ، دەزێتر ئاوێتەم بە.**
**لێرە تۆزو غوباری مەرگ لەسەر سیمامان نانیشێ، دەزێتر ئاوێتەم بە**
**لێرە شەقامەکان پاکن، پارکە گەورەکانی ئەڤینی پاکن،**
**لێرە ئاوێتە بوون هەیە، تۆزو غوبار نییە.. دە زێتر ئاوێتەم بە ئاوێتە..!**
**دڵ تەنگ مەبە ئەی ئەڤینم،**
**کەڤرستانیش دەکەینە جێ راوگەی ئەڤینی**
**چیتر خۆمان بە ئەشکەوتەکانی کەڤرستان ناسپێرین.**
**چیتر ناهێڵین ئەڤینداران نامراد بمرن**
**چیتر خۆمان نادەینە دەستی شەپۆلە تاریکەکانی**
**شەوە یەڵداییەکان**
**ئێمە ئامادەین لەپێناو ئەڤینیمان دا بمرین**
**چیتر خۆمان بە مەرگستانە بێ ئەڤینی یەکەی تاریکی ناسپێرین**
**ئێمە لە پێناو جێ ژووانی ئەڤینیمان شەوە تاریکەکانی دوێنێمان جێ هێشت**



**ئێمە لە پێناو دنیایەکی باشتری پڕ لە ئەڤین ماڵ و حاڵ و نیشتمانی**
**شەوە یەڵداییەکانمان جێ هێشت.**
**ئێمە لە پێناو دنیایەکی پڕ لە ئەڤین گیانبازیمان دا**
**ئێمە پەپوولەی بەهەشتی ئەڤینین، ئێرە ماڵمانە ماڵ...!**

**ئایاری ١٩٩٧**

* ئەو قەسیدەیەم لە کتێبی «وەسیەتەکانی هەڵم» بڵاوبۆتەوە، کە ئەم کتێبە کۆمەڵە شاعیرێک هەریەکەو بەدەقێکی شیعری بەشدارییان تێدا کردووە.

## مەنفای رۆح یان مەملەکەتی بەفر

سێبەری خەم و نزاکانم
رووبارێک لە ماسک و پێدەشتێک لە تابووتی لە کۆڵناوە.
لەگەڵ خوناوی سەرلێوی درەختەکان هەموو بەیانیان
مەمکە قنجەکانی زەوی ماچ دەکەن
هەورە ئیرەییەکانی ئاسمانی دڵم، شەوانان
گوزشتەی کوشتنی مەسیحم بۆ دەگێڕێتەوە
نهێنییە مۆمیا کراوەکانیشم بۆ ئاشکرا دەکات
گەشتی مەملەکەتی بەفرم تەواو بوو چیم دەست نەکەوت
پیاسەی کۆڵانە تاریکەکانی سەرابم تەواو بوو چیم دەست نەکەوت
خەوی شەوە یەڵداییەکانی باوەشی ئەستێرەشم تەواو بوو
هەر چیم دەست نەکەت.
برینە گەرمەکانی عەشق و ئەوینم مەکولێننەوە
سپیدە نێرەموکەکان لە جەولەی ئەمجارەیان دا بە تەنیا



جێ یان هێشتم.
تازە میهرەبانترین و یاقوتیترین ساتە قورئانییەکانمان
لە دەست دا.
ئێمە لە باوەشی مەرگەوە بەرەو مەنفاترین مەنفای رۆحانی دەڕۆین
ئێمە لە مەنفاترین مەنفای رۆحەوە بەرەو مەرگستانە ئەبەدییەکان
دەڕۆین.
وەرزەکان بۆ مردنم گۆرانی دەڵێن.
کەشتییەکانی نوح لە دەریای سینگم نغرۆ بوون
لەسەر پشتی مافورێکی سیحراویم
دەمێک لەبەر ڕێژنەی بارانە سەرابییەکانم، دەمێکیش
لەبەر گورزە تیشکەی خۆرەتاوی شەپۆڵە بێهودەییەکانی رۆح
دەمێک لەو دیو سنووری خەون و گەشتە ئەفسوناوییەکانم،
دەمێکیش ئەشقیایەکی شێت و پەنجە سڕبووەکانی خۆم دەکرۆژم.
لەبەردەم دوڕیانی مردن و لە دایک بوونەوە
سەرەڕێگاکان بە خوێن داپۆشراون.
ئەم بێهودەییەم لێم ناگەڕێ

ساتە رەشکەو پێشکەییەکانیش لێم بێزارن دوعای مردنم دەخوێنن
لەبوونی خۆم هیچ تاوانێک شک نابەم ئەی قەدەر
ئەم رێگا خەرەندییانەی مەرگ چی بوون نەبڕایەوە...!
لەبەردەم ئاوێنەی چارەنووس.
خۆڵی سەرگۆڕی گوناهمان هەڵدایەوەو شووشە بەتاڵەکانیشمان
پڕ سوورەت و نزا کرد.
پاکەتێک لە گوڵ و باخچەیەک لە عەترمان بە دیاری بۆ خاچە
شکاوەکان هێنا...!
بەم گۆرانییە خەراباتییە بە کوێ دەگەین..؟
ئەوە هەر سەمفۆنیاکەی دوێنێ مانە کە لە ناو بێ دەنگیمان تۆمارکرا
با ئەمڕۆکە، دەست لە لچکە کراسی فریشتە سپییەکان بەرنەدەین
بەڵکو ئەمجارە... بەنێو درزی شەختە سەرابییەکانی دەورەی پێم
بچینە دەرێ و بۆ ئەودیو مەملەکەتی بەفر بڕۆین.
لەم کەرنەڤاڵی مردن و ونبوونەدا.
دەبێ لەمەودوا چیتر بەدیار تیروکەوان و کەللەسەری مرۆڤە
نیاردەتالییەکانی سەدە کۆنەکان دانەنیشین..!



تا پایزی شازادە چیتر ئینقلاب بەسەر گەنجێتی عومرمان دا نەکات
ماچ و عەشق بەرەو کوێ چوون...؟
شەوە کۆڤانییەکان وا دەبریسکێتەوە
وەرن با لەم مەملەکەتی بەردینەدا رێ لەو شەپۆلانە بگرین.
کە عەشقمان لێ دەدزێ و سۆزو ئەوینی رۆحمان دەخەسێنێ.
بەبێ مروەت بوون و بە سارابوونی ئەم کەرنەڤاڵە دۆزەخییە
لەنێو چاوانی تەقسە میحرابییەکان دەبینم
گوڵە خەسێندراوەکان بەسەر خۆشی لەگەڵ «با»دا رۆیشتن
با بچین بیانگەڕێنینەوە... سەرە رێگاکان بگرین و دەروازەکانیش
دابخەین
کچە کافرۆشییەکان هەموویان مردن، کوڕە زەمبیل فرۆشەکانیش
کوژران.
لەم مەملەکەتەدا، عەشق پەرچەمێکی شوومەو ئەویندارانیش
تیرباران دەکرێن،
لەم مەنفای رۆح و لەم مەملەکەتی بەفرەدا.
لە شەوانی بەر ئاگردان جگە لە چیرۆکی منداڵیمان

دڵمان بە چیتر خۆش نابێ.
ئەی قەدەر من بە پەیمانی خۆکوشتن نەهاتوومەتە دنیا
دەکانییەک لە عەشق و رووبارێک لە سۆزم دەرێ
دەبە شەپۆڵەکان بڵێ ئەی قەدەر چیتر بنجە گیاو گوڵەکانم
لێ نەخەسێنێ.
دەبەکزەبای ئێواران بڵێ ئەی قەدەر چیتر هەورە سپییەکانم
لێ نەخەسێنێ.
لەناو مەتارێزی سەمای مەرگ و رەشەبادا
وا خەریکە لە پەرەمووچەی پاسارییە کۆچکردووەکان
مۆزەخانەیەک دروست دەکەین.
ئێستا زیاتر لە سەدەفی هێلکە شەیتانۆکەییەکانی پێدەشتی
منداڵیم دەترسێم.
ترسی ئەمڕۆ بارانێکە هەموو رۆژێ لە جێ ژوانی ئەوینیمان
تەڕمان دەکات.
سەراسیمەترین پەنجەرە ئافاتییەکانمان لێ دەکاتەوە.
رۆژانێک لە هەوارگە باڵندەییەکان



لەسەر گۆنای مانگ و درەختەکان دەخەوتین.
دەبا لە مەنزڵگەی چراخانی عەشقبازیمان قومە ئاوێک
بخۆینەوەو پشوویەک بدەین.
رۆژگارە سەرمەدییەکانی دوێنێشمان بیر نەچێتەوە.
دەبا رۆحی خەونەکانی دوێنێمان بژیێنینەوە.
ئەسپە زین کراوەکان چاوەڕێمانن.
با بڕۆین بەرەو مەتارێزی سەمای رۆح و مەنزڵگەکانی
عەشق و ئەوین..!

بەفرانباری ١٩٩٧

## پاکبوونەوە

بە تریفەی مانگ ڕۆژانی ڕابردووی خۆم هەڵدایەوە
بە گورزە ڕوناکی کازێوەش بەختی خۆم خوێندەوەو
داهاتووی خۆم بینی.
مرواری شەوانی بێ ڕۆشناییم، لە گەردنی خەونە ئاڵتوناوییەکانی
کچە کافرۆشییەکان ئاڵاوەو
لە بن باڵی باڵندەکان خۆی شاردۆتەوە...!
دیرۆکی فریشتە بەهەشتییەکان و تارای سپی بووکێنی گوڵ و
گۆرانی پەرەسێلکەکان.
ئێستە چیرۆکی بەرئاگردانی شەوانی زستانن
کەرنەڤاڵ... ئەی پەناگەی عەشق و ئەوینە ئەبەدییەکان
کەرنەڤاڵ... ئەی مەملەکەتی جەنگ و یەڵداو کارەسات.
ساڵنامەی پەنجە بەفرینەکانم بە بارێزەی سەراب مەنووسنەوە.
ئادەم تاوانبارە یان من ...!



حەوا تاوانبارە یان تۆ...!
یەقینم لەوەی،
بە کارێزەکانی سێبەرو فرمێسکەکانی شەوەزەنگ،
لە گوناهەکانمان پاک نابینەوە.
چیمان بەسەر دێت،
گەر لە ئاسمان یاخی بین و هەر بڕۆین و هەر بڕۆین.
بە دوای نهێنییەکانی ئەم کەونەدا بگەڕێین...؟
بە کوێ دەگەین،
گەر لە زەمین یاخی بین و هەر بڕۆین و هەر بڕۆین.
هەموو کیشوەرەکان جێ بهێڵین...؟
کۆچ: مارشی لە دایک بوونەوەی سبەینێ...!
مەرگ: گەیشتن بە ترۆپکی ڕەهایی...!
خۆکوشتن: مژینی مەمکە ئۆخژنییەکانی ڕۆح...!
خەونە پڕ شەهوەتییەکەی ڕووبار، لە ساتە زێڕینەکانی عومرم دەچێ
من لەگەمەو خۆبادان و سەمای ئاو دروست بووم
هەموو شەوێ بەلایلایەو گۆرانییەکانی ماسی دەخەوم.

بالّندە ئاوییەکانیش هێندە سەرخۆشن بە دەم رشانەوە دەنوزێنەوە
گوزشتەی بێ دالّدەیی خۆیان دەگێڕنەوە.
من وەسیەتنامەی «با»م لە ژێر سوخمەی شەپۆلەکانی رووبار
هەڵگرتووە.
کتێبی حەیرانەکانی پایزو خەونە بێهودەییەکانی باران و لە دایک بوونی
دەریام ختم کردووە.
گەڵا هەڵوەریوەکان،
لەناو شەڕابی ونبوون دۆش داماون.
نیگا شەرمنەکانی خۆرەتاو لە ئێوارەیەکی خەمناک
بەسەر شەقامەکانی ئێسک بەبێ دەنگی ڕادەبووری.
ئیمپراتۆریەتی پەپوولەمان لەدەست دا.
لەمەودوا شیعری سپی لە شەوانی پەپوولەیی بە زەحمەت دەنووسرێ..!
یەقینم لەوەی،
تازە بەژێرکردنەوەی شەونمی سەر درەختەکان و
هێورکردنەوەی شەپۆلە تەلیسماوییەکان، لە گوناهەکانمان پاکنابینەوە
با بڕۆین لەسەر ئەستێرەیەکی تر بۆ خۆمان مۆسیقا بژەنین و



لەگەڵ شنەی دەریا ژوان بگرین.
لەو شەوانە رزگارمان بێت
کە پێش خەوتن، خەونە ئەفسوناوییەکانمان پەنجەی پێغەمبەرەکان بکرۆژن
با بڕۆین... باران، شەونم، درەخت، هەموو بە دوامانەوەی دێن.
با بڕۆین... بۆ خۆمان لە وێندەرێ خۆمان پاکبکەینەوە
پەنجەرەی داخراوی حەزەکانمان بخەینە سەر گازی پشت و لە گۆنای مانگ رابمێنین
لێرە لەناو دەریایەکی مەنگ دەبێ بەدوای ئەلبومی منداڵیمان بگەڕێین
سێبەری قەدپاڵی چیاکان لەمەرگ ناترسێن و بێ باکن.
دەچرایەکان هەڵکەنەوە.
وا خەریکە ئیرەیی بە مەراقەکانی خوا دەبەم.
نازانم نهێنییەکانی مردنم چ حیکمەتێکی تیابوو...!؟
نازانم کفن کردنی گوڵە فیردەوسییەکانی رۆحم و بزەی ئەستێرەکان
بەرەو کوێم دەبات.
نازانم نا،
قسەی ناو کتێبە فەلسەفییەکان، کەی بە هانامەوە دێن...؟
دەچرایەکان هەڵکەنەوە..

لەم ئەشکەوتە، خوا دێتە خزمەت پێغەمبەرەکان.
لەم ئەشکەوتە تاریکەدا... ماچ و گوڵ پێکەوە دەنێژرێن
کچە سۆزانییە مەمک شۆڕەکان، خەون بەستیانەوە دەبینن
دەروێشەکان بە قەوزەی سەر بەردەبازەکان، دەست نوێژ دەشۆن.
نەفرەت لە مۆسیقا و لەلەش و لارە زایەندییەکەی حۆرییان دەکەن.
دەچرایەکان هەڵکەنەوە...
بەڵکو ئەمشەو حۆرییەکان دێنە میوانم
بەسەرهاتی خۆم و ئێوەیان بۆ دەگێڕمەوەو داوایان لێ دەکەم.
لەگەڵ خۆیان بمانبەن بۆ بەهەشت.
با بڕۆین لەبەردەرگای بەهەشت مانبگرین
دەڵێین هاتووین خۆمان پاکبکەینەوە
بەرگی شەڕو ئاژاوەو خیانەتی سەر زەمینمان فڕێ داوە.
ئێمە دەستەی یاخی بووەکانین، دەمانەوێ لە بەهەشت بمرین...!
نەفرەت لە پەرستگاو میحراب و گومبەزو ئاتشگەکانی سەر زەمین دەکەین
نەیانتوانی خەون و خەیاڵمان پاکبکەنەوە...!
نەفرەت لە خەونە پیسەکانی خۆمان دەکەین



با بڕۆین، هەموو ئەستێرەکان بگەڕێین و چرایەکان داگیرسێنینەوە.
ئەمشەو تروسکاییەک دیار نییە،
چارەنووسمان لەو شەوەزەنگە رەشترە...!
ئای لەم قەدەرە بێ رەحمە.
خەون: ئەی کەشتییە گەورەکانی سەفەر
بەهەشت: ئەی کەرنەڤاڵی سەمای حۆریە شەهوەتبازەکان و رەهایی خەیاڵ
رووبارێک نەما، سکاڵا نامەکانمان نەگەیەنێتە خوا.
کانییەک نەما، نوێژە بارانی لەسەر نەکەین.
منداڵێک نەما، مسی لەسەر نەتاوێنینەوە.
ژەنەراڵێک نەما، دەمانچە تۆپلییەکەی بە سینگمان تاقی نەکاتەوە
دارسنۆبەرێک نەما، دارەبازەی لێ دروست نەکەین.
مەلایکەتێک نەما، شەوانان یا سینمان لەسەر نەخوێنێ.
حۆرییەک نەما، هەموو دەم ناولەپمان نەخوێنێتەوە.
شەمشەمە کوێرێک نەما، بە نوێژی نیوەڕۆ نەبێ بە دەلیلمان...!
لەنێو خەراباتی دڵی ئەم ئەشکەوتە تاریکەدا
مۆمەکان کوژانەوە، کۆشکە شووشە بەندەکان شکان،

خاچەکان بە دیوار هەڵواسرانەوەو خوێنیان پێدادەچۆڕێ.
کەللە سەری مێروولەکان دەکەنە زەنگیانە بۆ گەردانەی ملی شاژنەکان
دوێنێ لە شەوێکی ساماڵ بەدەم کرێوەی بەفرەوە.
خەونەکانی «با» و هەورە بارانە بەهارییەکان سەفەریان کرد
لە یاداشتنامەی باپیرەم خوێندوومەتەوە.
لە شەوی ساماڵ و بەفردا، سەفەر شوومە...!
لەم دەڤەرە ماندووەم،
کەژاوەی کۆچ بەڕێوەیە، کەرنەڤاڵی ماڵئاوایی و مردن و فەنابوون بەڕێوەیە..!
نە لەشەوی ساماڵ و بەفر دەترسێن.
نە لە بازگەو سنوورەکان و خەرەندو دارستانە چڕەکان...!
کام سپیدە، کام خەون، کام ڕەشەبا...؟
دەتوانێ بەری ئەم کۆچە شوومە بگرێ...!
کۆچە کۆچ... بەرەو بەهەشتی فەنابوون... بەرەو کێڵگەی گوڵەگەنم
کۆچە کۆچ... بەرەو سەمای کەنار دەریای قەدەرێکی تر.
وای لەدەست نەهەنگە ئەزەلییەکانی شەڕ، وا سەرسینگی دەریاکان
سپی دەچنەوە سپی...!



دەک وەبەر نەعلەت و نەفرەتی مێژوو کەون
وای لەدەست کڵۆ بەفرە بێ ئامانەکان، ڕەگی دارسێوە لاسوورەکان.
سڕبوون و چیتر پێ ناگەن.
وەی لۆ وەی لۆ..
کۆچ بەردەوامە، بەفریش بێ ئامان دادەکا.
سپیدە پێڵووە خەواڵووەکانیش بەبەردەوامی جەستە سڕبووەکەی
خۆیان گەرم دەکەنەوە.
مێژوو دەڕشێتەوەو دارسنۆبەرەکان گۆرانی دەڵێن.
مێژوو دەگرێ و ئاسک و کەروێشکە کێوییەکانیش لەبەردەم ئەشکەوتەکان
سەما دەکەن.
مێژوو ئەمشەو لەسەر نۆمانگ و نۆ ڕۆژی خۆیەتی
مێژوو دەیەوێ حۆرییەکانی بەهەشت ناوکی ببڕن...!
مێژوو دەیەوێ کەلەسکەکەی ڕزگاری بوو، میوەجاتی
بەهەشت بخواو بە گەڵا دارچڕوەکانی بەهەشت داپۆشن...!
با بڕۆین لەبەر دەرگای بەهەشت مانبگرین.
با مێژوومان لەدەست نەچێت.

با مێژوو و ئایندەمان لەدەست نەچێ
بابڕۆین لەم زەمینە یاخی ببین..
خۆمان لە گوناهەکانمان پاکبکەینەوەو
نەفرەت لە سێبەری گەردەلوول و لە تارماییەکانی مەرگ بکەین..!

١٩٩٦/٨/٢٨



## ماچە وەنەوشەییەکان

بۆ پێکێک شەڕابی ڕەهابوون
بەرسیلەترین مەمکی خۆزگەکانی خۆرەتاو،
لەنێو پەنجەکانم دەتوێنمەوە.
ئەی ئەسمەرتر لە ئارامی خوناو بمکوژە
گریانی ساتە پەمەییەکان ئۆخژنی ڕۆحە ڕۆح...!
ئەی مەریەمی ڕەنگاڵەترین وەنەوشە... ڕەهام کە
ئەی خرپنتر لە ڕەنگم، خەونێکی شووشەییم پێیە، مەمکەکانی
خۆتم پێ ببەخشە.
ئەی نوژەنتر لە بەفر، بەفرینتر لە ماچە ڕۆژهەڵاتییەکان.
ڕۆژهەڵاتی تر لە فەنتازیای لەنجە سک پڕەکانی هەرزەیی.
لە ئامێزت هەڵم بگرەو بەباغ و بێستانی فیردەوسی خۆتم بسپێرە.
ئەی شالوریتر لە درەخت، درەختی تر لە ئاو، ئاوی تر لە بوون

لە ئامێزت هەڵم بگرەو بە ئەستێرکەیەکی پڕ لە گوڵاوم بسپێرە.
لە کاژی کۆترە سپییەکانم هەڵکێشە
تاکو منیش وەکو کوڕە شوانە ئەشقیایەکان
- ئەفسانەی خۆشەویستی - خۆمت بۆ بگێڕمەوە...!
ئەی گوڵ.. رامبێنە لەگەڵ خەونە بێوەژنییەکانم
رامبێنە لەگەڵ، زەمەنە سووریاوەکانی ئەندێشەم.
رامبێنە لەگەڵ، ساتە سەرمەدییەکانی سەحەرو سەهەندە
سەرابییەکانی سەروەری.
«...چ گۆرانییەکی وڕێنە ئامێزە، یەقینە ئەزەلییەکانی ئەزەل
ئەی ئەزەلیترین هەرەس،
ئەی هەرەسیترین یەقینە ئەزەلییە ئەشکەوتیەکان.
فیردەوس... زەمەنێکی پەپوولەیی و سەمایەکی عەشقئامێزو
گەمەیەکی زایەندییە بەر لە مردن..!
فیردەوس.. خۆزگەکانی درەخت و مەراقەکانی ماسی و هەناسەکانی
کازیوەیە بەر لە مردن...!»



ئەی شیزوفرینیاتر لە هزرە لەت لەت بووەکانی جەستە ئۆدیبییەکان.
ئەی ئۆدیبیتر لە جەستە لەت لەت بووەکانی هزرە شیزۆفرینیاییەکان
وورد ببنەوە ورد...!
وەرن لە کانی بەرماڵانی عەشق
لە بەهەشتە خەنەبەندانییەکانی بەر لە مەرگ،
تێنوێتی خۆتان بشکێنن
ماندوون، ئەشکەوتە تاریکەکان، شەوەزەنگە تاریکەکان
کوچەو هەوارگە تاریکەکان جەستەتانی شێلاوە.
دەوەرن، خۆتان بدەنە بەر بارانە کەژالییەکانی بەرائەت
لەبەردەم باڵا شەنگەبییەکەی -راشیل- چۆک دا بدەن.
شیعر.. چ دنیایەکی پڕ پەنهان و پڕ سیحرو پڕ عەشق و پڕ مۆسیقاو
پڕ لەنجەو پڕ هەناسەو پڕ سەمفۆنیا و گوڵ و گۆرانی و گەمەو سۆزو
ئەندێشەو..
چ دنیایەکی ئاڵ و واڵای ئەبەدییە شیعر...!؟
فیردەوس: درەختێکی ئۆدیبییە جارجار گەمەم لەگەڵ دەکات و

جارجارەش شەڕ.
شیعر... لاوکێکی ئۆدیبییە،
عەشقی رۆحی و ماچی رۆحی و توانەوەی رۆحی و لەزەتی رۆحی و
گریانی رۆحیم پێ دەبەخشێ..!
دەبا بگریێین، هێندە بگرین.. تا منداڵ دەبینەوە
گریان –لەنجەو خۆبادان و رەشبەڵەکی خواستەکانی گوڵە گەنمە.
دەبا بگریێین بۆ چەند ساتێک با ساتە جیوەییەکان لەیاد بکەین.
ئەی گوڵ .. هەڵم بگرەو لە ئامێزت مەمکی ئەستێرەکان گڕدەدەم.
ئەستێرە سوورەکان، زەردەکان، سەوزەکان، شینەکان، بەنەفسەجییەکان
ئەی گوڵ هەڵم بگرەو لە ئامێزت،
چاوی پەلکە زێڕینەو گۆنای مانگ و گەردنی باران گڕ دەدەم...!
با بنۆشین ئابجۆیە نارنجییەکانی خەون
باخۆمان تێر بکەین، لە ماچە سپییەکانی بەهار.
با ساپساپانێ بکەین، بەگەردە هەڵمەکانی هاوین.
با پیاسە بکەین، لە کۆڵانە زەردەڵووەکانی پاییز



با سەما بکەین، لەسەر شەختە شووشەییەکانی زستان
ئەی گڕی عەشقە وەنەوشەییەکانی شیعر
هەموو ساتەکان و رۆژەکان و وەرزەکان و زەمەنە کریستالییەکانت گڕ دەدەم..!
چەندە جوان بوو، ژانە سپیدەییەکانی – گالیلۆ–
چەند بەسۆز بوو، گۆرانییە بەجۆشە خەمناکەکەی ئارامییە پڕ عەشقەکەی
«مام تۆم»...!
رەهام کە ئەی گوڵ، وێڵم بەدوای ساتە ئەدیسۆنییەکانی شەوەزەنگ
وێڵم بەدوای، لەزەتی شەوە پەردەییەکانی گیا
وێڵم بەدوای، ختووکەی خەوە خەنەبەندانییەکانی خۆر..!
وێڵم بەدوای، شنەی نەسیمی ئێواران..
پەنجەرەکراوەکان..
ناڵە ناڵی بارانەکان و تاڤگەکان و درەختەکان...!
ئەی گوڵ ئەی نەسیمتر لە هەناسەم،
خەمە ئاوریشمییە لەت لەت بووەکانم، ئەلبوومی سەفەرە سەرابییەکانم
هەگبە لە خاچ دراوەکانم... کۆکەرەوە.

من جەستەیەکم لە عەشق... بم لێسەوە... بم خوێنەوە
لە ئامێزت هەڵم بگرەو
غەرێقەیەک لە هەنگوین و
ئاسمانێک لە ئەستێرەو
دەریایەک لە باڵندەو
فارغۆنێک لە سێوم پێیە...!
بەختەوەرن، ناخە هەمیشە رەنگاوییەکەی «بابە نۆئێلییەکان»
سەرمەستن، کورە نەخشینە نازەنینە لانەوازەکانی سەر شۆستەکانی ونبوون
شیرینن، پێکەنینە شین باوەکانی شەوانی شەمامە شێتەکان.
جەرگبڕن، زەماوەندە مەرگ ئامێزەکانی فەنابوونی قەدەر
ئەی گوڵ رەهام کە..
من لە بازبازێنە بەردەوامەکانی/ بەرد، ئاو، درەخت، خۆر...
لە دایک بووم...!
لەگەڵ گۆرانییەکانی پەپوولەش باڵام کرد.
ئەم سەفەرە پاکیزەییە پەمەییە چەندە جوانە جوان...!



بەردەوام دەبن... گۆرانییە ئەفسوناوییەکانی عەشق
نابڕێنەوە... سەمفۆنیای تاڤگە گەرمەکانی بوون.
کۆتایی نایە... سەفەرەکانی «ئاو» و غار غارانێی ماسییەکان...!
بەردەوام دەبن... هەموو گۆرانییەکان، ماچەکان، عەشقەکان،
شەڕەکان، گەمەکان...!
نابڕێنەوە... موعاناتی ژانە کوشندەییەکانی شەودرەنگانی منداڵیم
نابڕێنەوە... چیرۆکە لەرزۆکە شەرمنۆکاوییەکانی هەرزەییم
بەختەوەرم، بۆ ئەو ساتە سووریاوە قورمزییە سوورمەییانەی
تیا بە عاشق بووم.
عاشق بوونی من لەو شەوە دەست پێ دەکات
کە لە ژوورێکی تاریک مۆمێکی بەفریناوی لێواو لێو لە عەشقم داگیرساند
خزامە نێو دەریایە پڕ شەپۆلە لەزەتاوییەکەی شەهوەت.
جەستەیەکی نەرم و شلم شێلا.
لەخەونە سیحراوییەکان و لە سیحرە جوانییەکانی مەمک گەیشتم...!
ئەی گوڵ، لە ئامێزت هەڵم بگرەو..

من جەستەیەکم لە عەشقێکی ئەبەدی و شەوانان،
سەمای زایەندیت بۆ دەکەم و گۆرانییە سوورمەییەکانت بۆ دەڵێم...!
من هاودڵی شنەی شەماڵە ناسکەکان و ڕێبوارە پاکیزەییەکانم...!
چ ئازارێکە،
ژانی ژوانە ژەنگرتووەکانی کەنار کەمەری زەمەنە زەقنەبووتییەکان!؟
چ شەو ڕازێکە، ژانی ژوانە ژاڵەییەکانی شەوانە پڕ ترسەکان..!؟
شیرینە شیلانییەکان، دەست لە تەشی ڕستن هەڵناگرن.
دەڕێسن، ئەفسانەی مژینی مەمکە خەمۆکییەکان.
دەڕێسن، پێکەنینە بەردینە بەربڵاوە ئەشکەوتییەکان.
چەند گوناهە گوناه...! خاپووربوونی نوکتە خەم ڕەوێنەکان.
بە باڵابڕانی... «بێ بەشی و پەشێوی و بێ کەسی و ...» ناوە خەمناکە
ناڵەییەکانی نائومێدی
ئەی شاپوریترین ڕێنوارە ڕێگا سووریاوەکانی ئەوین.
مۆمە لەت لەت بووەکانی لە دایک بوونم کۆکەرەوەو لەناو لەپی دەستەکانم
دایان گیرسێنەوە.



بابسووتێ، سوورمەیی چاوە خەواڵووە خۆڵەمێشییەکانی بێداریم
با بشڵەژێ، دڵە فەوارە فوراتییە خوێنینەکەم
ئەی گوڵێ ئارامم کە، لە باوەشە ئارامییەکەی خۆت هەڵم بگرەو
بە فیردەوسی ئارامی دڵە ئارامییەکانم بسپێرە...!
موسافیرم.. لە مەملەکەتێکی سپی لە دایک بووم و بەرەو هەوارگەیەکی
وەنەوشەیی ڕێ دەکەم.
ڕێبوارم... خەمە ڕێبوارییەکان و عەشقە ڕێبوارییەکان و خواستە
ڕێبوارییەکانم لە کۆڵە...!
چەند پاکیزەن، خەونە لاوژەییەکانی سەحەرە متوربەکراوەکان.
ڕێ دەکەم، ڕێگا فەرشکراوەکانی خەونەکانم ڕەنگ دەکەم.
ڕێ دەکەم، تا بە دەروازەی نهێنییەکانی ڕێگای هەوارگە دوور دوورە
ڕەنگاوڕەنگەکان دەگەم.
کویە پڕ لە گوڵەکان دەدۆزمەوە...!
با بنەخشێنین ڕێگاکان..
با ئاجوغتر کەین ڕەنگەکان..

با ڕەنگاوڕەنگ تر کەین کەڤاڵەکان..
کەڤاڵی عەشقە تامەزرۆییە گەرم گەرمە ڕەونەقاوییەکان
کەڤاڵی شیوەنی مەرگ و زەماوەندی لەدایک بوونەوەی دەنگەکان و ڕەنگەکان
با سەماگەی سەماکارە دڵ پەپوولەییەکان گەورەتر کەین
با بریسکەدارتر کەین،
ئەڵقەی بووکێنی عاشقە دڵ بەسۆیە سووتاوەکانی خەلوزی
بسووتێنین، خەوننامەی خەونە ناخۆش ناخۆشەکانی.
پەڕاوە فێڵاوییەکان.
بسووتێنین، پەڕاوە زەردباوە فێڵاوییەکانی خەونە ناخۆشەکان
ئەی دڵ ناسکتر لە سەبکی پەپوولە،
منیش موسافیرم وەکو تۆ..
لە ئامێزە قەدیفاوییە ئاوریشماوییەکەت هەڵم بگرەو
منیش هاودڵی ڕێبوارە پاکیزەکان و پاکیزە ناسک ناسکە چاوکاڵەکانم...!
رامەکە، ئەی دڵ ناسکتر لە ئاسکە فریشتەییەکان
رامەکە، با لەم ڕەهەندە خڕخڕە خڕاوییەو لەم شەوگارە مارانگازاوییە



تەنیا نەبم...!
جەستە عەشقئامێزاوییەکەم تۆزی نامۆیی لەسەر نیشتووە
نامۆم بەرامبەر، بەم زەمەنە خۆڵ خۆڵاوییە خولیاییەم،
بەم سەفەرە سەرابییە عەشقاوییەم،
بەم خەرەندە خەندە خەنداوییەم..!
نامۆم بەرامبەر،
بە جەستەم..
بە هەستەم..
بە خەونەکانم..
بە رازەکانم..
نامەوێ نا ، تەنیابم لە شەوگارە پەنهانییە بێ ڕەنگەکان...!
نامەوێ لە ساتە موچڕکئامێزەکان،
لە گۆشەی تەنیایی شەڕابی مەرگاوی بنۆشم.
با وێران کەین.. گۆشە وێران وێرانەکانی تەنیایی.
با وێران کەین... گۆشە تەنها تەنهاییەکانی نامۆیی.

ئەی غوربەتتر لە زەمەن با بسوتێنین، کاژە نامۆییەکانی تەنیایی.
بارێ بکەین، رووەو کەرنەڤاڵە رەنگاڵەییەکانی زەمەنە ئەرخەوانییەکان
با رێ بکەین بەرەو بە خونچەتر بوونی زەمەنە ئەرخەوانییەکانی خەون
نەوەستین بەدیار، شەربە قەوزە گرتووە بەردینییەکانی تەژی تەژی
لە سەمفۆنیایە خەمۆکییەکان.
نەوەستین بەدیار، قەوزە وشک هەڵاتووەکانی دەورەی شەربە کۆنەکانی
تەژی تەژی لە ساتە،
شەرمناوییە کوشنداوییە بێ گوناهییە رۆژهەڵاتییەکان..!
با برۆین ئەی گوڵ،
لە ئامێزت هەڵمبگرەو نامەوێ تەنیابم
من سەفەریم،
موسافیرەکانیش، گەر لە ئامێزی گوڵ رێ بکەن.
بەدوا مەنزڵگەو بە رازە گوڵ گوڵییەکانی دڵی خۆیان دەگەن...!
من رێبواریم،
رێبوارییەکانیش، گەر بە بازی ئاسکە ناسکۆڵە چاوتیژە گوڵ



پاکیزەییەکان رێ بکەن..
بەدوا مەنزڵگەو بە رازە گوڵ گوڵییەکانی دڵی خۆیان دەگەن..!
ئەی نازدارتر لە رازەکانم،
رازی دڵم بخوێنەوە...،
رەهایی بوونم لە خاچ مەدە.
خەونە قورمزییە عەشقاوییەکەم، لە خاچ مەدە.
گوڵە گیان، دڵ ب ە خ ش ن د ە ب ە... دڵ ب ە خ ش ن د ە..!
ئەی گوڵ،
لە ئامێزت هەڵم بگرەو لێم گەڕێ،، تا ئەبەد،
لە کەنار مەمکە بەرسیلەییەکانت رابکێشم و ماچێکی هێندە وەنەوشەییت
لێ بکەم..
تا جەستەم تەژی تر دەبێ لە عەشقە وەنەوشەییەکانی
گوڵە وەنەوشە وەنەوشەییەکانی وەنەوشەیی....!

مانگی ١١ی ١٩٩٧

سەرەتایەک بۆ خەمە سپییەکانمان

❖ عەشق و بەرائەتی ئاو پێشکەشە بە...
ئەوانەی لە ماڵەکانیان گۆرانی عەشق دەڵێن.
ماڵەکانیان پڕاوپڕە لە بەختەوەری...
ئەوانەی بەرەو هەوارگەیەک دەڕۆن، کە مرۆڤەکان لەوێندەرێ
بە ڕەهایی سەما دەکەن و گۆرانی دەڵێن و پێدەکەنن.
ئەوانەی لە کۆشکە شووشەبەندە چراخانییەکانی عەشق.
سۆزانیترین خەونە رووبارەکانیان ... سەبەتەیەکە لە تریفە.
ماندوترن لە باران.
باڵا زراڤیترو شەنگەبیترو سنەوبەریترن لە مەرگ...!

**ناڵە حەسەن**


عەشق و بەرائەتی ئاو